## وشەیەک لەباتی پێشکەش

چەند بەشێکی ئەم باسە، بە جیا جیا، وەک پێداویستییەکی ئەکادیمی، لە بەهاری ٢٠٠١دا پێشکەشکرایە زانکۆی سەلاحەدین لە هەولێر. ئەو پرۆفیسۆر و یاردیدەدەری پرۆفیسۆرانەی کە ئەم تۆژینەوەی منیان چووبووە بەردەست بۆ هەڵسەنگاندن، ڕەزامەندییان پیشان نەدابوو کە بە «تۆژینەوەیەکی ئەکادیمی» حسێب بکرێت.

من لێرەدا خوێنەران تەنیا لەمە ئاگادار دەکەمەوە کە ئەم کتێبەی من، بە بۆچوونی ئەو ناوبراوە بەڕێزانەی زانکۆ: «ئەکادیمی» نیە...

# پێڕست

## پێشەکی

ئەم تۆژینەوەیە هەوڵدانێکە بۆ روونکردنەوەی رۆڵی شاعیری نووبێژ، عەبدولڕەحیم رەحمی هەکاری (١٨٩٠-١٩٥٨) لە بواری تازەکردنەوەی شیعری کوردیدا. ئامانجمان ئەوەیە کە بتوانین بسەلمێنین: نەخشی عەبدولڕەحیم رەحمی هەکاری لە تازەکردنەوەی شیعردا بە چەند ساڵێک دەکەوێتە پێش هەوڵدانەکانی رەشید نەجیب، عەبدولڕەحمان بەگی نفووسی، شێخ نوری شێخ ساڵح و گۆران. هەروەها بتوانین لەم بوارەدا دەستاوەردە تازەکانی ناوبراو دەسنیشان بکەین. بێگومان ئەم کارەش یارمەتیمان دەدات بتوانین باشتر و زانستییانەتر مێژووی تازەبوونەوەی شیعری کوردی بنووسینەوە، کە بەدرێژایی مێژوو، سەبارەت بە دەیان هۆ، نەمانتوانیوە کارەکە بکەین.

لە بەشێکی دیکەی ئەم تۆژینەوەیەدا، دەمانەوێ توانا و بەهرەی مۆدێرنیستانەی ناوبراو لە بواری شانۆنامەدا ڕوون بکەینەوە کە جمکانەی هەمان بیری نوێخوازانەی ناوبراوە لە بواری شیعردا؛ یەکەمین شانۆنامە بە زمانی کوردی چۆن لەسەر دەستی ئەم نووسەرە مۆدێرنیستەی چارەگی یەکەمی سەدەی بیستەم هاتە کایەوە؟!

یەکەمین تۆژەر کە ناوی عەبدولڕەحیم رەحمی هەکاریی هێنابێت

محەمەد ئەمین بۆز ئارسلانە، ئەمەش کاتێ سەرجەم ژمارەکانی گۆڤاری (ژین)ی ئەستەمبۆڵی ١٩١٨-١٩١٩ کۆکردەوە و بە ئەلفوبێی لاتینی، لەگەڵ پێشەکیەک، لە ئۆپسالا (لە سوێد) لە ساڵی ١٩٨٥ لە چاپی دانەوە. ئینجا د. عیزەدین مستەفا رەسوول لە کتێبی (ئەدەبیاتی نوێی کوردی) لە ساڵی ١٩٩٠دا ئاماژەیەکی بە رۆڵی ئەم شاعیرە نووبێژە کردووە. پاشان حازم کلیچ زۆربەی بەرهەمەکانی، لەگەڵ پێشەکیەک، بە ئەلفوبێی لاتینی، لە دانمارک لە ساڵی ١٩٩١ لەچاپداوەتەوە. لە دیماهیشدا، کاک شەوکەت سندی، بە سوودوەرگرتن لە تۆژینەوە و باس و وتارەکانی ئێمە - کە بۆ خۆیشی بەئاشکرا لە کتێبەکەی خۆیدا ئاماژەی بۆ کردوون - لە سالی ١٩٩٩دا کتێبێکی لەم بارەیەوە چاپ کرد. هەموو ئەمانە، بێ ئەوەی بەشێوەیەکی فراوان و ئەکادیمی، لە نەخشی ناوبراو لە بواری شانۆنامە و تازەگەریێتی شیعرەکانی و دەوری پێشڕەوانەی ئەو بکۆڵنەوە.

کەواتە ئەم کتێبەی بەردەست، یەکەمین هەوڵدانی فراوانە کە دەوری ئەم نووسەرە نووبێژە لە بواری داهێنانی شانۆنامە و تازەکردنەوەی شیعری کوردیدا دەخاتە ژێر تیشکی تۆژینەوەی ئەکادیمیەوە.

## پۆرترێت

عەبدولڕەحیم ڕەحمی هەکاری(١٨٩٠-١٩٥٨) لە گوندی ئەلباکێ Albake کە بە(باشقەلآ) ناسراوە و ئێستا قەزایەکە سەر بە شاری(وان)، لە دایکبووە. باوکی، سەید محەممەد پرتەو، لە بنەماڵەی سەید عەبدولقادری گەیلانی بوو. دایکیشی، ئیمەتوڵا خانم، کچی حاجی تەییار بەگ، لە بنەماڵەی عەبباسییان بووە.[١] خوێندنی سەرەتایی لە گوندەکەی خۆیان، ناوەندیشی لە شاری(وان) تەواو کردووە. (دارالمعلمین)یشی هەر لەوێ تەواو کردووە، لەگەڵ وەرگرتنی ئیجازەی خوێندنی دینی لەسەر دەستی برای سەید عەبدولحەکیم، تەها ئەرواسی. پاشان چۆتە(ئەنقەرە) و لەوێ لە(پەیمانگەی دارایی) خوێندوویەتی.خوێندنی باڵایشی لە زانکۆی (ئیلاهیات) لە ئەستەمبۆڵ تەواو کردووە.

خێزانی ناوبراو، ناوی هیدایەت عەزیز، لە بنەماڵەی بەدرخانیەکان بووە، دوو کوڕ و دوو کچیان هەبووە: پرتەو، مەتین، لەگەڵ ژاڵە و هاڵە. پرتەو لە ١٩٨٧، مەتینیش لە ١٩٧٥ کۆچی دوایی کردووە. ژاڵە ئێستا لە ئەستەمبۆڵ، هالەش لە سوێد دەژی، کە خێزانی نووسەری شەهید(مووسا عەنتەر) بووە و لە ١٩٤٤ شووی پێ کردووە.

هەکاری لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٥٨دا کۆچی دوایی دەکات و لە گۆڕستانی نەجاتی بەگ Necati Beg لە ئەستەمبۆڵ

دەنێژرێت[٢].

شاعیر بە چەندین ئیمزا و نازناوی جۆراوجۆرەوە بەرهەمەکانی خۆی بڵاو دەکردەوە:

١- زاپسوو Zapsu.(عەبدولرەحیم زاپسو). (زاپ سوو) بە تورکی واتە(ئاوی چەم)، یان(ئاوی زێی زاب). ئەمەش بە ناوی زێیەکەی مەڵبەندی خۆیان کە دەرژێتە رووباری دیجلەوە.

٢- هەکاری.(عەبدولرەحیم ر.حمی هەکاری). ئەمەش لەبەر ئەوەی سەر بە بنەماڵە و مەڵبەندی هەکاریی کوردستانی تورکیا بووە.

٣- ژ مالا هەکاریان ع. رحمی. [٣]

## بڵاوکراوەکانی

ع. رەحمی هەکاری، جگە لە زمانی خۆی، ئەم زمانانەیشی دەزانی: تورکی، عەرەبی، فارسی، هەروەها رووسی و ئەڵمانیش.(٤) بەڵام بەرهەم و کتێبی تەنیا بە زمانی کوردی و تورکی بڵاوکردۆتەوە. گرنگترینیان ئەمان:

١- لە ساڵی ١٩١٨دا، واتە لە تەمەنی ٢٨ ساڵیدا، یەکەم بەرهەمی نووسەر: پارچە شیعرێکە بە ناونیشانی (بانگ)، لە لاپەڕە (١١)ی گۆڤاری(ژین) لە ئەستەمبۆڵ بڵاودەکرێتەوە.

لە ماوەی دوو ساڵی تەمەنی گۆڤاری ژین(١٩١٨-١٩١٩)، شاعیری ناوبراو(٢٠) پارچە شیعر بە زمانی کوردی (بە دیالێکتی

هەکاری) بڵاودەکاتەوە (کە بابەتی ئەم لێکۆڵینەوەی ئێمەن).

٢- لەسەر لاپەڕەکانی گۆڤاری (ژین)دا، لە ماوەی ساڵانی ١٩١٨-١٩١٩، دوو چیرۆک بە زمانی تورکی(کە پاڵەوانەکان کوردن و ڕووداوەکان باس لە ژیانی کۆمەڵی کوردەواری دەکەن)؛ لەگەڵ حەوت پەخشانی هونەری و وتاری جۆراوجۆر، لە ژمارەکانی ١،٣،٥،٦،٧،٨،٩دا بڵاودەکاتەوە.[٥]

٣- شانۆنامەیەک بە ناونیشانی(مەمێ ئالان)، لە ژمارە (١٥)و (١٦)ی گۆڤاری(ژین)دا، بە زنجیرە، لە ساڵی ١٩١٩دا بڵاودەکاتەوە، کە بەمەش ع.ڕ. هەکاری دەبێتە یەکەم شانۆنامەنووسی کورد کە شانۆنامەی بە زمانی کوردی بڵاوکردبێتەوە.[٦]

بەپێی پڕۆپاگەندەی(اعلان) بەرگی دوواوەی ژمارە(٢١)ی گۆڤاری ژین لە ساڵی ١٩١٩دا: ئەم شانۆنامەیە لە شێوەی نامیلکەیەکی سەربەخۆدا، لە ساڵی ١٩١٩ لە ئەستەمبوڵ چاپکراوە و نرخی(٥) قڕووشی عوسمانی بووە. بەمەش، شانۆنامەی (مەمێ ئالان) نووسراوی عەبدولرەحیم ڕەحمی هەکاری، دەبێتە یەکەم شانۆنامەی کوردی کە بەشێوەیەکی سەربەخۆ لە نامیلکەیەکەدا چاپکرابێت.[٧]

٤- نامیلکەیەکی شیعری، بە ناونیشانی(گازیا وەلات)، لە ساڵی ١٩١٩ لە ئەستەمبوڵ؛ کە لەژێر ناونیشانەکەیدا نووسراوە (مەنزووم، بەرهەڤۆکا هەلبەستێن کوردی). بە (١٠) قڕووشی

عوسمانی فرۆشراوە.

٥- عەقیدا کوردان(علم الحال) مەنزووما کوردی، لە ١٩١٩ لە ئەستەمبۆڵ چاپکراوە. نرخی(٥) قرووش بووە[٨].

ناوبراو لە ماوەی ساڵانی ١٩٤٧-١٩٥٧دا، (١٨) کتێبی بە زمانی تورکی لەبارەی(دیانەت و مێژووی ئیسلامەتی و لێکدانەوەکانی دینی ئیسلام) لە ئەستەمبۆڵ چاپ و بڵاو کردۆتەوە. هەروەها(١١) کتێبی دیکەشی هەر بە زمانی تورکی، لەبارەی ئەخلاق و فەلسەفەوە، بە دەسنووس ماونەتەوە و هێشتا چاوەڕێی چاپن. هەروەها لە ساڵانی ١٩٤٠-١٩٥٠دا گۆڤارێکیشی بڵاوکردۆتەوە بە زمانی تورکی بە ناونیشانی Ehli Sunnet ئەهلی سوننەت، کە پازدە ڕۆژ جارێک، بۆ ماوەی حەوت ساڵان، لە ئەستەمبۆڵ بڵاوکراوتەوە[٩]

## چالاکییەکانی

پێش ساڵی ١٩١٧، واتە لە ماوەی جەنگی یەکەمی جیهانیدا، عەبدولڕەحیم ڕەحمی هەکاری، لە تەمەنی ٢٦-٢٧ ساڵیدا، لەگەڵ سەعید نوورسی، دەچێتە ڕیزی (بزاڤی ئیسلامی)یەوە: هەردووکیشیان پێکەوە لە جەنگی دەوڵەتی عوسمانیدا دژ بە رووسیای قەیسەری، دەچنە سەنگەرەکانی پێشەوەی جەنگ. لەوێ بریندار دەبێت، پاشان پێکەوە لەگەڵ سەعید نوورسی بەدیل دەگیرێن و بۆ ماوەی ساڵێک لە

گرتووخانەیەکی نزیک چەمی ڤۆڵگاvolga لە ناوچەی باتوم Batum، لە ناو عرووسان، بە دەسبەسەری ژیان بەسەر دەبەن. هەر لەوێش، لە ئەسارەتدا فێری رووسی و ئەڵمانی دەبێت.(١٠)

لەسەرەتای ساڵی ١٩١٨دا، ع. رەحمی هەکاری دەچێتە ئەستەمبۆڵ، کە ئەو کاتە بەشێکی زۆری نووسەر و رووناکبیرە کوردەکان رژابوونە ئەوێ و ئەستەمبۆڵیان کردبووە پایتەختی ئەدەبی و هونەری و چالاکییە سیاسییەکانی «خۆیان». لە کۆتایی هەمان ساڵدا، لەگەڵ خەلیل خەیاڵی و مەلا سەعید کوردی(نوورسی)و هەمزە بەگی مووکسی و چەندانی دیکە، دەبێتە ئەندامێکی چالاکی رێکخراوی(کۆمەڵەی پێشکەوتنی کوردستان کە لە مانگی ١٩١٨/١١دا لە ئەستەمبۆڵ دامەزرا بوو. ئینجا بە ئاگاداریی مێژوونووسی ناودار، محەممەد ئەمین بۆزئارسلان: دەبێتە ئەندامی(کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد- هیوا/ جمعیت هیڤی طلبان) کە لەساڵی ١٩١٢ لە ئەستەمبۆڵ دامەزرا بوو.(١١)

گۆڤاری ژین(١٩١٨/١١/٧ - ٢/ ١٩١٩/١٠)، کە لە ماوەی دوو ساڵدا، لە ئەستەمبۆڵ، (٢٥) ژمارەی لێ بڵاوکرایەوە؛ ئۆرگانێکی نیمچە رەسمی(کۆمەڵەی پێشکەوتنی کوردستان) بووە. بۆیەش، دەبینین: عەبدولرەحیم هەکاری، بەردەوام، لە هەموو ژمارەیەکی ئەو گۆڤارەدا نووسینێک یان بەرهەمێکی هەیە. بە نووسەرە هەرە چالاک و دیارەکانی گۆڤاری (ژین) دەژمێردرێت.

ناوبراو، لە ژیانی خۆیدا، (١٥) ساڵ مامۆستا، (١٥) ساڵ

کارمەندی دارایی بووە،(٧) ساڵیش سەرنووسەراتیی گۆڤارێکی تورکیی کردووە و رۆژنامەنووس بووە. نیوەی دووەمی ژیانی خۆی، لە کۆتاییدا، تەرخان کرد بۆ خزمەتکردنی دین و فەرهەنگی ئیسلامی. بۆیەش، لە ساڵی ١٩٥١دا لەگەڵ وەفدێکی باڵای تورکیا چوو بۆ پاکستان بۆ ئەوەی بەشداری بکات لە کۆنگرەی جیهانیی ئیسلامەتیدا.[١٢]

## زەمینەی فەلسەفی و فیکریی نووسەر

دوو قۆناغی فیکریی جیاواز لە ژیانی سیاسی و ئەدەبیی شاعیردا دەبینرێن:

١- ساڵانی ١٩١٨-١٩٢٣. ئەم قۆناغەی ژیانی سیاسی و ئەدەبیی شاعیر بە خەباتی ناسیونالیستی و وڵاتپارێزی و کوردایەتی دەناسرێتەوە.

٢- ساڵانی ١٩٢٣-١٩٥٨.

لە ١٩٢٣ بەولاوە، واتە دووای ئەوەی ئەتاتورک زمانی کوردی و کولتووری کوردی و ناسنامەی کوردی لە تورکیادا قەدەغە دەکات، ئیتر ئەم نووسەرە «تێکشکاوە» وەک چەندین نووسەری کوردی دیکەی ئەستەمبۆڵ(کە ئیعدام کران و زندان کران و دەربەدەرکران) نائومێد دەبێت و پشت دەکاتە کوردایەتی؛ رێگای خزمەتکردنی دین و ئیسلامەتی دەگرێتە بەر.[١٣]

کەواتە هەرەسهێنانی هیوای سیاسیی کورد بەدەستی

ئەتاتورکەوە و لە پەیمانی لۆزان بەولاوە لە ١٩٢٣دا، یەکێکە لەو هۆکارانەی کە عەبدولڕەحیم هەکاری، چیتر وەکو ساڵانی ١٩١٨-١٩٢٣، ناسیونالیستانە بیر نەکاتەوە؛ چیتر بە زمانی کوردی نەنووسێت و گۆرانی بۆ خەباتی نەتەوەیی نەڵێت. ناسینی زانای ناوداری کوردی ئیسلام، مەلا سەعید کوردی(نوورسی)، ئینجا ئیجازە وەرگرتنی خوێندنی دینی لە قۆناغی سەرەتاییدا لەسەر دەستی سەید تەها ئەرواسی، پاشان کە دەچێتە ریزی بزاڤی ئیسلامییەوە، لە کۆتایشدا کاتێ خوێندنی بالا لە زانکۆی(ئیلاهیات) لە ئەستەمبۆڵ تەواو دەکات.. هەموو ئەمانە بە چەند هۆکار و کەناڵێکی دیکە دەژمێردرێن بۆ پێکهێنانی بیرکردنەوەیەکی ئیسلامیانە لەلای ئەو لەبارەی چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوەیی.(١٤)

ئەم بیرکردنەوە ئیسلامییە، وەک پاشان دەبینین، زۆر بەئاشکرا و بەشێوەیەکی فراوان بەسەر بەرهەمەکانیدا رەنگ دەداتەوە.

## زەمینە و کەناڵەکانی نوێخوازی لای شاعیر

کۆمەڵێک هۆکاری جۆراوجۆر هەن کە رۆڵی خۆیان دەبینن بۆ ئەوەی عەبدولڕەحیم رەحمیی گەنج، لە ماوەی ١٩١٨-١٩٢٣دا بە شێوەیەکی جیاواز بیر بکاتەوە و نوێخوازانە بڕوانێتە ژیان و داهێنان و کێشەی نەتەوەکەی:(١٥)

١- سەردەمی ژیانی شاعیر، سەردەمی سەرهەڵدانی بیری

ناسیوونالیزمی کورد و راپەڕینە نیشتمانییەکانی کوردە[١٦]:

- شۆڕشی یەزدان شێر(١٨٥٣-١٨٥٥)

- شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵلای نەهری(١٨٨٠)

- دامەزراندنی حزبی (ئیتحیاد و تەرەقی) لەلایەن دوو سیاسەتمەداری کورد (د. عەبدوڵلا جەودەت و د. ئیسحاق سکووتی) و داواکردنیان بۆ دامەزراندنی حکومەتێکی دەستووری و دادپەروەر لە چوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانیدا

- راپەڕینی سمکۆ ئاغای شکاک لە کوردستانی ئێراندا (١٩١٣-١٩٢٥)

- شۆڕشی شێخ عەبدولسەلامی بارزانی (١٩٠٧-١٩١٤)

- شۆڕشی شێخ مەحموود لە کوردستانی عێراقدا(١٩١٩)، تا دەگاتە داخوازینامە نێودەوڵەتیەکەی ژەنەڕاڵ شەریف پاشا لە کۆنفرانسی ئاشتی لە پاریس لە ساڵی ١٩١٩ بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی.[١٧]

سەرهەڵدانی ئەم بیرە ناسیوونالیستی و ئەم راپەڕینە چەکداری و نەتەوەییانە رۆڵێکی گرنگیان هەبووە بەسەر چاوکرانەوەی شاعیر بۆئەوەی بتوانێت بەشێوەیەکی جیاواز و تازە بڕوانێتە ژیان.

٢- هەر لە ئەنجامی ئەمەدا، دەبینین: لە ساڵی ١٨٩٨ بەملاوە تاکو ١٩٢٣، یەکەمین کۆمەڵە و رێکخراوە سیاسی و پیشەیی و ئافرەتانە و خوێندکارییە کوردییەکان، لەگەڵ یەکەمین رۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکان، پاشانیش یەکەمین چاپخانە و قوتابخانە

کوردییەکان سەرهەڵدەدەن.[18]

ئەمانە هەمووی، بێگومان، کەم تا زۆر، کاریگەریتی خۆیان نواندووە بەسەر بیرکردنەوەی شاعیر. تەنانەت بۆ خۆیشی بە شێوەیەکی راستەوخۆ لەناو رووداوەکاندا ژیاوە و ئەندامی دوو رێکخراوی خەباتگێڕی کوردی بووە و لە یەکێک لە گۆڤارەکانی ئەواندا (لە گۆڤاری ژین ١٩١٨-١٩١٩) چالاکانە کاری کردووە.[19]

٣- لە سەردەمی گەنجێتیی شاعیردا، کوردستان بۆ یەکەمین جار لە مێژووی خۆیدا، دەرگا و پەنجەرەکانی خۆی بەسەر فەرهەنگ و ئەدەبیاتی رۆژئاوادا دەخاتە سەر پشت؛ سوود لە زمان و کولتوور و سیستەمی بیرکردنەوەی ئەورووپا دەبینێت. ئەمەش لە دوو کەناڵەوە بووە، کە هەر دوو کەناڵیش گرێدراوی یەکترن:

**کەناڵی یەکەم:** بەشێوەیەکی راستەوخۆ، لە رێگای زانینی زمانێکی ئەورووپییەوە بووە، بۆ نموونە: رەفیق حیلمی، مەمدووح سەلیم بەگ، میقداد-مەدحەت، د. عەبدوڵڵا جەودەت، حوسێن حوزنی موکریانی، شەریف پاشا فەرەنسییان زانیوە و راستەوخۆ سوودیان لەو زمانە بینیوە.[20] عەبدولڕەحیم هەکاری-خۆیشی، رووسی و ئەڵمانیی زانیوە، هەڵبەتە کەم تا زۆر توانیویەتی شیعر و ئەدەبیاتی نەوژەنی ئەڵمانی و رووسی بەسەر بکاتەوە.

کاریگەریتیی ئەدەبیاتی ئەورووپا و سیستەمی مەعریفیی رۆژئاوا بەسەر نووسەر و رووناکبیرانی وەک عەبدولڕەحیم هەکاری

لە ئەستەمبوڵ لە ماوەی چارەگی یەکەمی ئەم سەدەیەدا نکوڵی لێ ناکرێت. ئەوەتا گرووپی نووسەرانی(ژین)، ئەو گرووپەی کە ناوبراو بۆ خۆیشی ئەندامیان بووە، لە ژمارە(١)ی گۆڤاری(ژین)دا لە ١٩١٨/١١/٧، لەژێر کاری کولتووری رۆژئاواییدا دەڵێن:

«ئایدیۆلۆژیەتە کۆمەڵایەتی و سیاسیە کۆنەکان، ئەمڕۆ، روو لە هەرەسن. ئێمە ئەمڕۆ بەشداری لە سازکردنی چەند رێباز و پرەنسیپێکی تازە دەکەین».[٢١]

جگە لەمە، ئەو بەڵگەیەش لە بیرنەکەین کە ئەم کاریگەرییە ئەورووپاییە راستەوخۆیە، بۆتە یەکێک لەو هۆکارانەی وایانکردوە کە عەبدولڕەحیم هەکاری-خۆی، بۆ یەکەمین جار لە مێژووی ئەدەبیاتی کوریدا، فۆرم و جۆرێکی نوێی هونەری بهێنێتە ناو ئەدەبی کوردییەوە و بە کوردانی بناسێنێت، کە ئەویش(شانۆنامە)یە و فۆرمێکی ئەدەبیی رۆژئاواییە.[٢٢]

**کەناڵی دووەم:** بەشێوەیەکی ناڕاستەخۆ، لە رێگای زانینی زمانی تورکییەوە. هەروەها ژیان لەناو کەشوهەوایەکی شارستانیی پێشکەوتووی وەک ئەستەمبوڵ، کە ئەوکاتە بۆ شاعیر و نووسەر و رووناکبیرە کوردەکان بە «پایتەختی ئەدەبیات و هونەر» دەژمێردرا.[٢٣]

لە کۆتایی سەدەی ١٩و سەرەتای ئەم سەدەیەدا، هەرچی بزووتنەوەیەکی ئایدیۆلۆژی و ئەدەبی و هونەری لە ئەورووپا دروست

ببووایە، یەکسەر لە ئەستەمبۆڵدا دەنگی دەدایەوە و بڵاودەبۆوە.[٢٤] بێگومان، ئەو نووسەرە کوردانەی لەو ماوەیەدا لە ئەستەمبۆڵ ژیاون(پیرەمێرد، عەبدولڕەحیم رەحمی هەکاری، مستەفا شەوقی، محەمەد میهری...هتد) کەم تا زۆر هەر دەبێت کەوتبێتنە ژێر زەبری شەپۆڵەکانی ئەو پێشکەوتنە ئەدەبییەی ئەورووپاوە، کە لە ئەستەمبۆڵ بە زمانی تورکی دەگەیشتنە دەست کوردەکان. جگە لە شەپۆڵی ئەورووپا، کۆمەڵێک گۆڤاری هونەری و ئەدەبی تورکیش، کە لەژێر کاریگەریتیی قوتابخانەی(ریالیستی)و (پەرناس)و ڕێبازە تازەکانی دیکەی ئەوروپادا بوون، لەو سەردەمەدا کاریگەریتیی خۆیان بەسەر نووسەرە کوردەکاندا دەنواند، لەوانە:

– گۆڤاری (گەنج قەڵەملار/قەڵەمە گەنجەکان)، ئەستەمبۆڵ: ١٩٠٨. سەرنووسەری ئەم گۆڤارە، رووناکبیری بە بنەچە کورد، زیا گۆگالب دیاربەکری بوو. لە کۆتاییدا، ئەم گۆڤارەش هەر کەوتە ژێر زەبری شەپۆڵی(فەجری ئاتی)یەوە.

– گۆڤاری(یێنی مەجموعە/کۆمەڵەی نوێ)، ئەستەمبۆڵ: ١٩٠٨. لەلایەن کۆمەڵەی ئیتحیاد و تەرەقی یەوە بڵاودەبۆوە.

– گۆڤاری(سەروەتی فنوون) کە لە ساڵی ١٩٠٩ بەولاوە لە ئەستەمبۆڵ کەوتە بڵاوبوونەوە؛ قوتابخانەیەکی ئەدەبیی دروستکرد بەناوی قوتابخانەی (فەجری ئاتی)یەوە. دیارترین نووسەرانی ئەم قوتابخانەیە– کە لەم گۆڤارەدا بەرهەمیان بڵاو دەکردەوە– ئەمانە

بوون: تۆفیق فیکرەت، ئەحمەد هاشم، خالید ئیحسان، فوئاد کۆپرلی.[٢٤]

جگە لە دەیان گۆڤاری گرنگی دیکەی وەکو(شهبال ١٩٠٩)، (اجتهاد ١٩١٨)،(شاعر ١٩١٨)،(ئینجی ١٩١٩)،(تماشا مصور تیاترۆ ١٩١٨).

پیرەمێردی شاعیر، کە بۆ خۆی لە ماوەی ساڵانی ١٨٩٧-١٩٢٣دا لە ئەستەمبۆڵ، لەناو ئەم جموجۆڵە ئەدەبییەدا ژیاوە، شایەدیمان بۆ دەدات و دەڵێ:

«ئێواران، کە لە ئەستەمبۆڵەوە بە واپۆڕ ئەگەڕامەوە بۆ لانەی سەعادەتی خۆم، کە ئوطظە بوو، وە کە سەروەتی فنوونم لە گۆگرتەی ئەو واپۆڕی سەر دەریای مەڕمەڕیەدا ئەخوێندەوە؛ تەئسیری ئەو شیعر و ئەدەبیاتە لە سندبادی بەحری زیاتر ئەیخستمە سەر دەریای خولیاوە».[٢٥]

پیرەمێرد، لە ئەستەمبۆڵ، تەنانەت هاوڕێی نزیک و دراوسێی دوو کەڵە نووسەری ڕێبەری ئەم بزووتنەوە ئەدەبییەی تورکیا بووە: دراوسێی ئەکردم ڕەجایی زادە(کۆنە سەرنووسەری گۆڤاری ثروت فنون ١٨٩٦-١٩٠١)، هەروەها خالید زیا عوششاقی زادە، کە هەردووکیان لە یەک کۆڵان، تەنانەت لە یەک ئاپارتماندا، لەگەڵ پیرەمێرد ژیاون. پیرەمێرد لەم بارەوە دەڵێ:

«یەکەم جار لە ئوطظە دراوسێی ڕەجایی زادە ئەکردم بەگ و عوششاقی زادە خالید بەگ و حسین ڕەحمی بووم، ڕەزا

تۆفـیـقـیـشـیـان پێ ناسـاندم. ئیـتـر کـەوتمە بەهەشـتی سـەروەتی فنوونەوە» .[٢٦]

پیـرەمـێـرد دان بەوەدا دەنێت کـە زۆربەی نووسـەرە کـوردەکـانی جیلی خۆی، لەژێر کاریگەرێتیی ئەو کەشوهەوایەی ئەستەمبۆڵەوە، کەوتنە سەر کەڵکەڵەی نووبێژی و تازەکردنەوەی شیعری کوردی. لەم بارەوە دەڵێ:

«ئێمە، زۆرترمان، لەوێوە پێگەیشتووین» .[٢٧]

کەواتە ئەم رەوتە نوێخوازییەی عەبدولڕەحیم هەکاریش، کە لەم بیست و یەک پارچە شیعرەیدا هەستی پێدەکرێت، بەری داری ئەو روانینە نەوژەنەی هەکارییە، کە لەو ساڵانەدا، لەژێر کاریگەرێتیی شیعری ئەورووپی و جمۆجۆڵی شیعری هاوچەرخی تورکەکاندا، لە ئەستەمبۆڵ، لای خەملّیبوو.

## نوێگەرێتیی شیعرەکانی

١- شـاعـیـر بیـست پارچە شـیـعـری لە گـۆڤـاری ژین(١٩١٨/١١/٧ - ١٩١٩/١٠/٢) لە ئەسـتـەمـبـۆڵ بڵاوکردۆتەوە. ئەم دیاردەیە، واتە بڵاوکردنەوەی بیست پارچە شیعر لەسەر لاپەڕەی گۆڤارێکدا، دیاردەیەکی تازەیە و بۆ یەکەمین جارە لە مێـژووی ئەدەبیاتی شیـعری کوردیدا دەبینرێت. پێش هەکاری، هیـچ شـاعـیـرێکی دیکەی کـورد نابینین کـە بەم شـێـوەیەی ئەو، ڕۆژنامەگەریی وەک ئامرازێک بۆ بڵاوکردنەوەی مۆدێرنیزم و شیعرە

نوێخــوازەکــانی بەکــارهێنابێت و ڕژد بووبێت لەســەر خــەباتی نوێگەرانەی شیعری خۆی. شیعرەکان ئەمانەن:

- **بانگ، ژمارە**(١)، **لاپەڕە**(١١)، ٧ی **چیریا پاشین**: ١٩١٨.
- **قەوی ب خارنا زەعیفان دژین**، ژ (٢)،ل(١٤)، ١٩١٨.
- **عەشقا وەلات، ژ (٣)، ل ١٤-١٥، ١٩١٨.**
- **دەستێ تەنێ دەنگ ژێ نایەت، ژ (٥)، ل ١٤، ١٩١٩.**
- **سەلایا شەڤ، ژ (٦)، ١٩١٩.**
- **ژ بۆ نەسلا تێت، ژ (٨)، ل ١٦-١٨، ١٩١٩.**
- **بێ هیڤی نەبن، ژ(٩)، ل ١٤، ١٩١٩.**
- **زەنگ، ژ (١٠)، ل ١٢، ١٩١٩.**
- **نالینا سێویکی، ژ (١١)، ل ١٢، ١٩١٩.**
- **حي على الصلاة**، ژ (١٣)، ل ١٤.
- **تەبریک، ژ (١٤)، ل (٢٢).**
- **نوور، ژ (١٥)، ل(٢٢).**
- **ژ بۆ شەریف پاشا، ژ(٢١)، ل ١٥-١٦.**
- **نەزانین، ژ (١٧)، ل (١٦).**
- **مرۆڤینە، ژ (١٨)، ل (١٦-١٧).**
- **لۆمە ژ بلبل، ژ (١٩)، ل ٢٠-٢١.**
- **ژ بۆ جڤاتا دایکان، ژ (٢٢)، ل (١٦).**
- **گازییا دویماهیکێ، ژ (٢٣)، ل (١٧).**
- **فیرقەت، ژ (٢٤)، ل (١٧).**

**- ویسڵەت، ژ(٢٥)، ل (٢٣-٢٤)، ئەستەمبۆڵ: ١٩١٩.**

**- هەروەها پارچە شیعرێکی دیکە بە ناونیشانی (شەهیدێ کوردستان.. حەمزە) کە لە ١٧ی گوڵانی ١٩٢٠دا نووسراوە.**

لە سەردەمی پێش ع.ڕ. هەکاری دا، هیچ شاعیرێکی کورد نیە کە شیعری خۆی لە گۆڤارێکدا بڵاوکردبێتەوە. ئەگەر هەشبووبێت (لە گۆڤاری هەتاوی کورد و ڕۆژی کورد ١٩١٣دا)، ئەوا ژمارەی شیعرە بڵاوکراوەکانیان تەنیا یەک یان دوو پارچە شیعر بووە.

کەواتە ع.ڕ. هەکاری، یەکەمین شاعیری هاوچەرخی کوردە کە بەرهەمەکانی خۆی(بیست پارچە شیعری) لە گۆڤارێکی کوردیدا بڵاوکردبێتەوە؛ هەروەها گۆڤاری کردبێتە دەستاوەردێک بۆ گەیاندنی پرۆژەیەکی نوێکردنەوەی شیعری.

٢- نووسەر لە تەمەنی (٢٨)ساڵیدا نامیلکەیەکی شیعری، بە ناونیشانی(گازیا وەلات) لە ئەستەمبۆڵ، لە ساڵی(١٩١٩) بڵاوکردۆتەوە، کە لەژێر ناونیشانەکەیدا نووسراوە (مەنزووم، بەرهەڤۆکا هەڵبەستێن کوردی). هەروەها، لە هەمان ساڵ و شوێندا کتێبێکی شیعری دیکەشی بە ناونیشانی(عەقیدا کوردان) بڵاوکردۆتەوە.[٢٨]

بەم شێوەیە، دیوانی (گازیا وەلات) نووسراوی عەبدولرەحیم هەکاری، دەبێتە یەکەم دیوانە شیعری هاوچەرخی شاعیرێک کە خۆی لە ژیاندا بێت و دیوانەکەی چاپکرابێت.

لە سەردەمی پێش ع.ڕ. هەکاری، هیچ شاعیرێکی دیکەی کورد لە مێژووی ئەدەبیماندا نیە، کە لە تەمەنی(٢٨) ساڵیدا، یان لە هەر هەرەتێکی دیکەی تەمەنی خۆیدا دیوانی خۆی لە چاپخانە چاپ و بڵاوکردبێتەوە و لە گۆڤارێکیشدا پرۆپاگەندەی بۆ کرابێت!

بەم شێوەیە، ناوبراو یەکەمین شاعیری کوردی سەدەی بیستەمە کە لە ماوەی ژیانی خۆیدا، دیوانەکەی چاپ و بڵاوکرابێتەوە. ئەم دیاردەیەش، خۆی لە خۆیدا، دیاردەیەکی تازە و نوقڵانەیەکی مژدەبەخشی شاعیرە لەڕووی باوەڕهەبوون بە تازەکردنەوەی شیعرییەوە.

٣- لای هەکاری، دەبینین: بۆ یەکەمین جار شاعیرێکی کورد(ناونیشان) بۆ شیعرەکانی خۆی دادەنێت.

دانانی ناونیشان لەسەر شیعرێکی خۆت، کارێکی تازەگەرییە. ئەمەش چونکە لە سەرتاپای مێژووی شیعری سەدەکانی رابردووماندا دانانی ناونیشان بۆ بەرهەم نەبۆتە دیاردەیەکی باو.

هەڵبژاردنی ناونیشان بۆ تێکست دیاردەیەکی مۆدێرن و نەریتێکی مۆدێرنیزمی ئەوروپاییە. پەیڕەوکردنی ئەم نەریتە، بۆ یەکەمین جار لە مێژووی شیعری کوردیدا، بەڵگە و سەلمێنی ئەوەیە کە ناوبراو شاعیرێکی مۆدێرن بووە و پەیڕەوی مۆدێرنیزمی رۆژئاوای کردووە.

٤- ئەگەر یەکێک لە مەرجەکانی داهێنانی شیعری، هەبوونی روانینێکی تاکڕەوانە و شەخسیی تازە بێت(کە پێشتر لە مێژووی

شـــيـعـــری ئەم گـەلەدا بەدی نەکـرا بێت)؛ ئەوا لەم حـاڵەتەدا، عەبدولڕەحیم رەحمی هەکاری، ڕاستییەکەی، لە بواری داهێنانی روانینی شەخسییەوە، هیچی تازەییەکی ئەوتۆی دانەهێناوە.

هەستی نەتەوایەتی و جۆشدانی خەباتی نیشتمانیپەروەری، کە لە زۆربەی شـیـعـرەکـانی هەکـاری دا هەن، نابێت فـریـومـان بدەن و وامـــان لێ بکەن کــە ئەم دیاردەیە بە دیاردەیەکی نەوژەن و تـازە بزانین. ئەمەش چونکە، ئەم دیاردەیە، هەر لە سەردەمی ئەحمەدی خانی یەوە، پاشان لای حاجی قادری کۆیی دا هەبووە. کەواتە، لەم رووەوە، تازەگـەرییـەکـانی ع. هەکـاری پێــویســتــە لە چەند گۆشەنیگایەکی دیکەوە لێیان بکۆڵدرێتەوە.

شـاعـیـر لە چەند سەرچاوەیەکی دینیـیـەوە ئاوی خـواردۆتەوە، بیـرکـردنەوەیەکی ئیـسـلامـیـیـانەی بۆ چارەسـەرکـردنی کـێـشـەی نەتەوایەتی هەبـووە: هەوڵی داوە تێگەیشـــتنە دینی و چەمکە ئیسلامییەکان لە بۆتەی بیری ناسیونالیزمی کوردیدا بتوێنێتەوە؛ واتە ویسـتـوویەتی دین و ناسـیـونالیـزم بەیەکەوە بلکێنێت. هەر ئەمەشە تایبەتمەندێتی روانینی هەکاری.

ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە، واتە لکاندنی دین و هەستی نەتەوەیی، کە پێی دەڵێن«تەوفـیـقـیـەت»، لەسەرەتای ئەم سەدەیەدا- لە کـاتی داڕووخانی دەوڵەتی عوسمانیدا-، رەوتێکی باوی سەردەمەکە بووە و پێی گـوتراوە (پان-ئیـسـلامی) کە لە پاڵ (پان- عـوسـمـانی) و ناسـیـونالیـزم و عـەلمانیـەت، لە شـێـوەی چەند هێـلـێـکی تەریبـدا

دەڕۆیشتن. پارچە شیعرەکانی (بانگ)، (سەلایا شەڤ)، (بێ هێڤی)، (حی علی الصلاە)، (نوور)، (نەزانین)....نموونەی دیاری ئەم جۆرە بیرکردنەوەن:

«ئەڵڵاهو ئەکبەر» دەنگێ مناری
«رابن» دبێژن، هەر وەک هەواری

**(بانگ)**

ریا مە نها گرتی
ریا هەقە، بێ پەروا
تەسدیق دکەت هەر کەس
هەم رازبیە پێ مەولا

**(بێ هێڤی نەبن)**

دەنگەک ژ مناری تێت
گازی دکەتن مەلا:
هشیار بن، رابن
دژمن نەکەت ئیستیلا.

**(حي علي الصلاة)**

دنیا وەکی چێکر خوەدێ، بەهرا مە ژی دابوو
لاکین ژ نەزانین و جەهل، کانێ؟ فیدا بوو.

**(نەزانین)**

ع.ڕ. هەکاری بیرێکی نەتەوەیی وشک و تیۆری دەرنابڕێت،

بەڵکو ئەو بیرە نەتەوەییەی خۆی بەناو دیاردە هاوچەرخ و رووداوە هاوسەردەمەکانی خۆیدا دەگێڕێت و ئاگری ئەو هەستە شۆڕشگێڕ و راچەنیوە بە جۆشتر دەکات. بۆ نموونە، کاتێ لە مانگی گولانی ١٩١٩دا لە ئەستەمبۆڵ (کۆمەڵەی پێشکەوتنی ژنانی کورد/ کورد قادینلار تعالی جمعیەتی ) دادەمەزرێت لە پێناو گرێدانەوەی خەباتی ئافرەتان بە خەباتی نەتەوەییەوە، ناوبراو دەم و دەست شیعرێکی پڕ جۆش و خرۆش بە ناونیشانی (ژ بۆ جڤاتا دایکان) دەنووسێت؛ پایە و ماف و داخوازییەکانی ئافرەتی کوردی تێدا جوان دەکات:

پرسی ژ عەسرێ دەوران: «فەن و تەرەقییا تە
دەوڵەت سەرێ چییە؟» گۆت «دەولەت سەرێ ژنانە»
لەورا قە ناحەون ئەو، شەڤ و رۆژ وان خەباتە
جا زارییەک مەزن کەن؛ ژینا وەلات ب وانە

ئەم دەسپێشخەرییە بۆ بەسەرکردنەوەی ماف و داخوازییەکانی ئافرەتان، بە تازەگەرییەک دەژمێردرێت لەڕووی ناوەڕۆکی شیعرییەوە.

یان بۆ نمونە، کاتێ ژەنەراڵ شەریف پاشا لە ساڵی ١٩١٩، لە کۆنفرانسی نێودەوڵەتیانەی ئاشتی لە پاریس نوێنەرایەتی کوردان دەکات؛ هەکاری بە پارچە شیعرێک، بە ناونیشانی (ژ بۆ شەریف پاشا)، ئەم هەڵوێست و ئاواتە نیشتمانییەمان، بەرز و جوان رادەگرێت و شایەدی لەسەر رووداوێکی سیاسی مێژوویی دەدات:

دیسا ژ شەجاعەتا تە ئەی خان
دەربیەک ڤەبوو ژ بۆ مە کوردان
ئیدی بەسە ئەڤ جەفا و زیللەت
بێ عیلم و فەزل بمنینە میللەت

بەم شێوەیە، رووانینی ع. رەحمی هەکاری هەمان روانینی ناسیونالیستانەی خانی و حاجی یە لە بەرگ و سەردەمێکی تازەدا. ناوبراو ویستوویەتی پەرە بەم بیرە بدات، مۆرکێکی رۆمانسیانەی بداتێ؛ لە رێگەی وەسفکردنی جوانیی سروشتی کوردستانەوە کەشوهەوایەکی نەتەوەیی رۆمانسیانە وێنە بکێشێ.

لەرێگەی دەربڕینی جوانیی وڵات و سروشتی وڵاتەوە، شاعیر دەیەوێ وڵاتمان لەلا شیرین بکات و هەستی نەتەوەیی و نیشتیمانیمان زەرکەفت بکاتەوە:

بوهار هات، شین بوون گیا
جل بەرکرن، خەملین چیا
گەشتان بکەن سەر کانییا

**(عەشقا وەلات)**

دلۆ شا بە کو سەرساله
د مێرگان سۆسن و لاله

گولان وێ گرتیه ژاله
تەبیەت صامت و لاله
**(سەرسال)**

بلبل، چیه نالییاوه هەردەم!
یان هوون ژی وەک مه بێ وەلاتن؟
حاشا نه وەکی مه هوون سەفیلن
هێلوون وه هەیه خودان کەلاتن
**(لۆمه ژ بلبل)**

ئەم تازەگەرییه، ع.ڕ. هەکاری له ساڵی **١٩١٩**دا کردوویەتی؛ چەند ساڵێک دووای ئەو، ئنجا شاعیرانی کوردی عێراق: ڕەشید نەجیب، عەبدولڕەحمان بەگی نفووس، شێخ نووری شێخ ساڵح، گۆران، شوێن پێی هەڵدەگرن و هەر یەکە و بەپێی توانای خۆی، درێژەی پێ دەدەن. کەواتە، لێرەوە، دەوری پێشڕەوایەتیی عەبدولڕەحیم هەکاری له تازەکردنەوەی شیعری نوێماندا دەردەکەوێت.

٥- بابەتی (سۆزی دوورەوڵاتی) له شیعرەکانی(عەشقا وەلات) و (نەزانین) و (ویسڵەت)دا؛ هەروەها تێمی (بانگکردنی میللەت بۆ یەکیەتی و ڕاپەڕین و پێشکەوتن) له شیعرەکانی (ژ بۆ شەریف پاشا) و (سەلایا شەڤ)دا؛ ئنجا بیری (زۆرانبازی لەپێناو

مانەوەدا) لە شیعری (قەوی ب خارنا زەعیفان دژین)؛ هەروەها دەربڕینی هەستی باوکایەتی و چارەسەرکردنی پەیوەندیی نێوان باوک و ڕۆڵەکەی لە شیعری ( بۆ نەسلا تێت)؛ یان داکۆکی کردن لە ماف و ئازادیی ئافرەتانی کورد و گرێدانەوەی بە خەباتی نەتەوەیی لە شیعری بۆ نموونە (جڤاتا دایکان)دا؛ لە کۆتاییشدا تێمە ڕۆمانسییەکانی وەک قسەکردن لە زمانی سێوێکەوە و قسەکردن لەگەڵ بولبول لە شیعرەکانی ( نالینا سێوەکی) و ( لۆمە ژ بلبل)... هەموو ئەمانە، ئەگەرچی لای شاعیرانی پێشوو هەندێکیان باسکراون؛ بەڵام هەکاری بە ئاواز و شێوازێکی جیاواز و نوێ دەیانچڕێتەوە.

کەواتە، هێنانە ئارای بابەت و تێمی نوێ بۆ ناو شیعر، بەڵگە و نیشانەیەکی دیکەی نوێخوازێتیی شاعیرە.

٦- هەکاری، یەکێکە لەو شاعیرە نووبێژانەی کە (یەکیەتیی بابەت) لە شیعرەکانیدا، بە پێچەوانەی شیعری کۆنمان، دیاردەیەکی دیار و فراوانە. بەڵگە و نموونەی ئەم راستییە لە زۆربەی شیعرەکانیدا دەبینرێت. پێش هەکاری، ئەم دیاردەیە، لای شاعیرانی کورد، بەدەگمەن دەبینرا.

دابەشکردنی واتا بەسەر زیاتر لە بەیتێک و دوو بەیت، هونەرێکە بە دەگمەن لە شیعری کۆندا دەبینرێت. هەکاری، بە پێچەوانەی زۆربەی شاعیرانی سەردەمی پێشوو، توانیویەتی واتا و فیکرە بەسەر زیاتر لە بەیتێک پرژ و بڵاو بکاتەوە:

«ئەڵڵاهو ئەکبەر» دەنگێ منارێ
«رابن» دبێژت، هەروەک هەوارێ
«رابن» دبێژت، وەقتێ سبێیە
ساحێب خەباتن، شەیتان ل بێیە
پاقژ بکەن خۆ............. هتد

**(بانگ)**

هەروەها بڕوانە شیعری (ویسڵەت) و (فیرقەت) و (قەوی ب خارنا زەعیفان دژین).

٧- ئەگەر چاوپۆشی لە شاعیرانی دیالێکتی گۆران لە سەدەکانی ١٨ و ١٩ بکەین ( بێسارانی، مەولەوی، وەلی دێوانە..)؛ عەبدولڕەحیم ڕەحمی هەکاری یەکەمین شاعیری سەدەی بیستەمە کە کێشی پەنجەی ( کێشی رەسەنی خۆماڵی) لە شیعری کوردیدا بەکارهێنابێت. لەم بوارەدا، د.عیزەدین مستەفا رەسوول لە لاپەڕە (٥١)ی کتێبەکەی خۆیدا (ئەدەبیاتی نوێی کوردی؛ چاپی هەولێر: ١٩٩٠)، ئەم شاعیرە بە « رابەر» دادەنێت و دەڵێ:

«پێش ئەوەی کێشی پەنجە لە شیعری شێخ نووری و گۆران و پیرەمێردا ببینین، هەر لە شیعری بیر ڕووناک و رابەرێکی وەک عەبدولڕەحیم رەحمی هەکاریدا ئەم چەشنە کێشە دەبینین».

د. عیزەدین لە تۆژینەوەکەی خۆیدا، کە وەزارەتی خوێندنی باڵا و تۆژینەوەی زانستیی زانکۆی بەغدا بۆی چاپکردووە، چەند پارچە

شیعرێکی بە ناونیشانی (حی علی الصلاه ) بە نموونە هێناوەتەوە و پاشان لەبارەی شیعرەکانی ئەم شاعیرە ڕێبەرەوە دەڵێ:

« ئەگەر بەدووای کێشی ئەم شیعرانەدا بگەڕێین، ئەوا دەتوانین بە هەر دوو جۆر بیکێشین». بۆ نموونە، ئەم کۆپلەیەی خوارەوە، بە حسابی کێشی عەرووزی، دەبێتە (موتەدارەک):

دەنگەک / ژ منا / رێ تێت

فعلن / فعلن / فعلن

گازی / دکەتن / مەللا

فعلن / فعلن / فعلن

بە حسابی کێشی پەنجەش، بەم شێوەیە دەبێت:

دەن - گەک - ژ - منا - رێ - تێت ٢ + ٢+ ٢

گا - زی ، دک - تن - مەل - لا ٢ +٢+ ٢

کەواتە، وەک پێشتر د. عیزەدین مستەفا رەسوول ئاماژەی پێکردووە: عەبدولڕەحیم ڕەحمی هەکاری یەکەمین شاعیری سەدەی بیستەمە کە کێشی پەنجەی لە شیعری کوردیدا بەکارهێنابێت؛ لەم بوارەشدا دەبێتە ڕابەر.

٨- هەکاری لەو شاعیرە نوێخوازانەیە کە تەنیا لەسەر یەک جۆر کێش و یەک جۆری عەرووز کاری نەکردووە؛ بەڵکو ژمارەیەکی زۆر لە کێش و عەرووزەکانی تاقی کردۆتەوە:

- مستفعلاتن مستفعلاتن لە شیعری ( بانگ)دا، کە

ئەحمەدی خانی بەندێکی لە ( نەوبەهار)دا لەسەر ئەم کێشە هەیە.

- مستفعلن مستفعلن .. لە شیعری ( قەوی..).

- مفاعیلن .. لە شیعری ( سەلایا شەڤ) دا.

- مفعولن مفاعیلن مفاعیلن فعولن.. لە شیعری ( دەنگ) و ( نەزانین)دا.

- مفعولن مفاعیلن مفعولن مفاعیلن .. لە شیعری ( حی علی الصلاه)دا.

- کێشی رەجەز لە شیعری ( عەشقا وەلات) کە سەرواکەی تەرجیعە؛ لە هەندێ شیعری مەلای جەزیری دا بەکارهاتووە.

- کێشی هەزەج لە شیعری (بۆ نەسلا تێت) کە مەم و زینی ئەحمەدی خانی، هەمووی لەسەر ئەم کێشەیە.

جگە لەمەش نموونەی هەشت برگەیی ( ٤+ ٤ ) لە شیعرەکانی ئەم شاعیرەماندا زۆرن. لە هەمان کاتدا ئەگەر بۆ کێشەکانی دیکەش بگەرێین، نموونەیان هەر دەدۆزینەوە:

سبێ وەکی/ چوومە خەبات ٤+٤

قیزەک مە دیت / چۆلی دهات ٤+٤

یان:

ئەز مامە سێوی/ بێ دا و و بابم ٥+٥

خانیێ من سووتن/ ئەز مال خرابم ٥+٥

هەکاری، پێش عەبدولا گۆران کێشی (دە برگەیی) بەکار

هێناوە. ئەمە جگە لە بەکارهێنانی جۆرەکانی دیکەی کێشی پەنجە، لەگەڵ مەسنەوی، رەجەز، چوارین، ، شەشینە ( کە لەلای مەلای جەزیری زۆر بەکارهاتووە).

ئەم جۆراوجۆرێتییە، لە لای هەکاری، تەنانەت لەناو یەک تاکە شیعریشدا هەستی پێدەکرێت، بۆ نموونە لە شیعری(گازییا دوێماهیکێ)و (بێ هێڤی نەبن)دا.

لە بواری بەکارهێنانی سەرواشدا، ع. رەحمی هەکاری لە هەندێ شیعرەکانیدا، جۆرە سەروایەکی تازە دادەهێنێ کە بەدرێژایی مێژووی شیعری کوردی نەدیتراوە، لەلایەن شاعیرانی پێش خۆی و سەردەمی خۆیدا بەکارنەهاتووە؛ بۆ نموونە ئەم جۆرە سەروایەی خوارەوە لە شیعرەکانی (گازییا دیماهیکێ) و ( بێ هێڤی نەبن):

a ....................
b ...................
c ..................
b ...................

ئەمە جگە لە بەکارهێنانی ئەم جۆرە سەروا دەگمەنەی خوارەوە کە لە شیعرە تازەکەرەوەکانی فەرەنسیدا (بەتایبەتی لای رامبۆ) زۆر دەبینرێت:

a ....................
b ...................

a ...................
b ...................

بەم شێوەیە، بەکارهێنانی کێشی پەنجە لەلایەک، لەلایەکی دیکەشدا جۆراوجۆرێتیی کێش لەلای ئەم شاعیرە، لە سەرووی هەمووشیانەوە داهێنانی سەروای تازە؛ سەرەتایەکی دڵخۆشکەر بووە (بە گوێرەی ساڵی ١٩١٩) لە تازەکردنەوەی شیعری کوردیدا.

٩- لە ئەنجامی ئەم تێکیشکاندنە جۆراوجۆرانە و لە ئەنجامی ئەم وردە لادانە شیعرییانەی هەکاری، دەبینین تۆپۆگرافیای شیعر لای هەکاری گۆڕانی بەسەردا دێت. دابەشبوونی پانتاییە رەشەکان بەسەر لاپەڕەی سپیدا، لای هەکاری، جیاوازە لەگەڵ ئەوانی کلاسیک؛ وەک لەم خشتەیەدا بە چەند نموونەیەک روونی دەکەینەوە:

نموونەی پێش هەکاری (کۆن):

a ...................
a ...................
b ...................
a ...................
c ...................
a ...................
d ...................
a ...................

b ...................
b ...................
b ...................

c ...................
c ...................
c ...................
c ...................
c ...................

یان بڕوانە ئەم شێوەیە لە شیعری (دەستێ تەنێ دەنگ ژی نایەت)، کە تۆپۆگرافیایەکی تازەی هەیە:

a ...................
a ...........
a ...................
a ...........
b ...................

١٠- تاقیکردنەوەی فۆرم و تەکنیکی تازەی شیعری، دیاردەیەکی دیکەی تازەگەرابیە لای هەکاری. شیعری چیرۆک ئامێز، یان ئاخنینی چیرۆک لەناو شیعردا، هەروەها بەکارهێنانی دیالۆگ، قسەکردن لە زمانی سێویێکەوە یان قسەکردن لەگەڵ

بولبول ... چەند دیاردەیەکی نەوژەن و تازەن لە شیعرەکانی هەکاری دا، کە هەموو ئەمانەش پێش گۆران ئەنجام دراون. بۆ نموونە بڕوانە شیعرەکانی:(قەوی ب خارنا زەعیفان دژین)، ( عەشقا وەلات)، (ژ بۆ نەسلاتێت)، (نالینا سێوەکی)، (مرۆڤینە)، (لۆمە ژ بلبل)،(ژ بۆ جڤاتا دایکا).

١١- بەکارهێنانی وێنەی تازە، بەتایبەتیش بەکارهێنانی وێنە لەجیاتی راستەوخۆگۆیی(مباشرە).

شاعیر، بە پێچەوانەی کلاسیکەکان، لە جیاتی ئەوەی بە شێوەیەکی راستەوخۆ و راپۆرتنووسانە راستیەکت بۆ باس بکات، دێت لەجیاتی ئەم راستەوخۆگۆییە بە وێنەیەکی شیعری قسەکەت بۆ روون دەکاتەوە. هەکاری، لەجیاتی ئەوەی بەشێوەیەکی راستەوخۆ باسی خەرابادی وڵات و وێرانبوون و هەژاری بکات، لە شیعری(دەنگ)دا دەڵێ:

پەز چونە، دەوار مرنە

لەجیاتی ئەوەی بە شێوەیەکی راستەوخۆ بڵێت (بەهاری کوردستان خۆشە و سروشتی کوردستان جوانە)، دەڵێ:

بوهار هات، شین بوون گیا.

کۆنێد رەش، کەرێد پەز

جگە لە چەندان وێنەی شیعری تازەی ئەوتۆ کە نموونەیان لە سەدەکانی رابردوودا نابینین: (هەلکەن ژ بۆ خوە یەک چرا)، (تۆڤێ رەحمەتێ بچینن)، (ئەز مامە سێوی بێ دا و بابم).

## ئەنجام

**(١)**

لە ساڵی (١٩١٩) واتە ئەو ساڵەی کە عەبدولڕەحیم ڕەحمی هەکاری، لە تەمەنی (٢٨) ساڵیدا، بیست پارچە شیعرە نەوژەنەکەی خۆی و دوو دیوانە شیعر (گازیا وەلات) و (عەقیدا کوردان، مەنزووما کوردی) بڵاو دەکاتەوە: گۆران جارێ گەنجێکی (١٥) ساڵەیە و نازانێ «شیعری نوێ» چیشە! هەر لەو ساڵەدا، لەکاتێکدا ئەو هەموو شیعرە تازانەی ع.ر. هەکاری بە کتێب یان لە گۆڤاری (ژین)دا بڵاو دەکرێنەوە: شاعیرەکانی دیکەمان (ڕەشید نەجیب، شێخ نووری، ع.ب. نفووس...) جارێ هیچ شیعرێکیان، نە بە کتێب نە لە گۆڤار و ڕۆژنامەدا، بڵاو نەکردۆتەوە.

ع. ڕ. هەکاری، کەواتە، لەڕووی کرۆنیکەوە، یەکەمین نووگۆ و یەکەمین پێشڕەو بووە.

(٢)

لە رووی دەسپێکردنی بڵاوکردنەوە و گەیاندنی کاریگەرێتییەوە، بێگومان ع. ڕ. هەکاری بە پێشڕەو لەقەڵەم

دەدرێت. ئەمەش لەبەرئەوەی شاعیرەکانی دیکەمان، بام لە (١٩١٩)دا شیعریشیان هەبووبێت، بەڵام ئەو شیعرانەیان تەنیا بە دەسنووس ماونەتەوە، چاپ و بڵاو نەکراونەتەوە کە بتوانن کار لە چێژی باوی شیعردۆستان و شاعیرانی گەنج بکەن!

(٣)

لەساڵی (١٩١٩)دا، لە کاتێکدا ع. ڕەحمی هەکاری بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لە ناوجەرگەی ڕووداوە ڕۆشنبیرییەکاندا و لەناو دڵی جموجۆڵە ئەدەبییەکانی (فەجری ئاتی) و (سەروەتی فنوون) و دەنگدانەوەی کولتووری ڕۆژئاوادا لە ئەستەمبوڵ لەناو نووسەرە گەنجە تورکەکاندا ژیاوە و ڕاستەوخۆ سوودی لە بەرهەمەکانیان وەرگرتووە: شاعیرانی دیکەمان (ڕەشید نەجیب، شێخ نووری، عەبدولڕەحمان بەگی نفووسی) لە دەشتی شارەزوور یان لە سلێمانییەوە، لە دوورەوە دەیانڕوانییە ئەو جموجۆڵە نوێخوازە هەڵایساوەی ئەستەمبوڵ! هەرچی عەبدوڵڵا گۆرانیشە، جارێ هێشتا بستێک لە (هەڵەبجە) دوور نەکەوتبووەوە. [٢٩]

(٤)

کەواتە، دیسان، یەکەم شاعیرێکی هاوچەرخ (باسی کۆتایی سەدەی نۆزدەیەمی پیرەمێرد و حاجی قادری کۆیی ناکەین!) کە پێوەندیی بە کولتووری ڕۆژئاواییەوە کردبێت و بەشێوەیەکی

راستەوخۆ بەهرەی لە جموجۆڵە فەرهەنگییە رۆژئاواییە نوێخوازەکان وەرگرتبێت و لەناویاندا ژیابێت: عەبدولڕەحیم رەحمی هەکارییە!

ناوبراو، لەچاو شاعیرانی دیکەمان، یەکەمین شاعیری کوردە کە فێری زمانێکی ئەورووپایی (رووسی و ئەڵمانی) بووبێت و سوودی لێیان دیبێت بۆ دەوڵەمەندکردنی رۆشنبیریی شیعریی خۆی. بەکارهێنانی ژانرە تازەکانی وەک شانۆنامە و بەکارهێنانی دەیان زاراوەی تازەی وەک (پیەس)، (تیاتر).. لە نووسینەکانیدا، کە بۆ یەکەم جار دەکەونە ناو وێژەی کوردەوە، بەڵگەی ئەم راستییەن![30]

لە ئەنجامی ژیان لە ئەستەمبۆڵ و فێر بوونی رووسی و ئەڵمانی و وەرگرتنی ئەو کولتوورە رۆژئاواییە بەشێوەیەکی راستەوخۆ، ناوبراو دەبێتە یەکەم شاعیری هاوچەرخی کورد کە لە کولتووری ئیسلامی (عەرەبی- فارسی)یەوە بازبداتە سەر کولتووری رۆژئاوایی و پێکەوەیان گرێ بدات و سوود لە دووەمیان وەربگرێت. ئەمەش بە ئاشکرا، تا رادەیەک، بەسەر تەکنیک و فۆرمی شیعرەکانیدا رەنگی داوەتەوە.

(٥)

ناوبراو لە گەلێک بواری دیکەشدا بە رێبەری تازەکردنەوەی شیعری نوێ دادەنرێت: داهێنانی سەروای تازە، بەکارهێنانی کێشی پەنجە، بەکارهێنانی تێمی نوێ، فۆرم و تەکنیکی تازە،

هەروەها یەکـیـەتیی بابەت. هەمـوو ئەمـانـەش کـاریـان کـردە سـەر گـۆڕینی تۆپۆگـرافـیـای شـیـعـری لەلای هەکـاری، کـە ئەمـەش هەر کارێکی تازە بوو.

(٦)

ع. ڕ. هەکاری نەوهەنگاوێکی تازەکاری ئەوتۆ بووە کە پرۆسەی نوێکردنەوەکەی، بەشێـوەیەکی سادە و خۆڕسک دەست پێکردووە. بێگومان نەیتوانیوە هەمان کارە گرنگەکـانی گۆران ئەنجام بدات، بەڵام لەڕووی کرۆنیکەوە، بە هیچ شـێـوەیەک نابێت نەخشـی ئەم فەرامۆش بکەین.

(٧)

ئەو مـێـژوونـووسـانەی کـە لە داهاتـوودا دێن لە دیرۆکی تازەکـردنەوەی شـیـعـری کـوردیدا دەکـۆڵنەوە، لەڕووی زانسـتی و ئەکادیمییەوە هەروەها لەپێناو ئەوەی کە بۆچوونەکانیان ئۆبژەکتیڤ و دروست و ڕەوا بکەوێتەوە، لەسەریان پێویستە کە چیتر فەرامۆشی نەخشی ئەم شاعیرە مۆدێرنیستە نەکەن؛ چونکە ئەمڕۆ پایە و ڕۆڵی ع. ڕەحمی هەکاری لە ڕێڕەوی سەرهەلدانی شیعری نوێدا ئاشکرا کرا.

## سەرچاوە:

1): Hazim Kilic: Evdirehim Rehmiye HEKARI, Helbesvan u Niviskareki Welatparez, Wesanxana Xani u Bateyi, Danmark: 1991. R: 15-16.

2 - هەمان سەرچاوە.

(3), M. Emin BOZARSLAN: Jin(1918-1919) Wesanxana Deng, Uppsla, Swed: 1985-1987. 4 Cild

(4): H. KILIC: E.R.HEKARI, R. 49-52. 17

(5): M.E.BOZARSLAN: Jin.

٦- فەرهاد پیربالّ: کورتە پێشەکییەک بۆ سەرهەڵدانی شانۆنامە لە ئەدەبیاتی کوردیدا، گۆڤاری(هیوا)، ژمارە (٨)، بڵاوکراوەکانی ئەنستیووی کوردی پاریس، پاریس: ١٩٩٣/١، ل ٥١-٧٢.

٧- د. فەرهاد پیربالّ: کرۆنۆلۆژیای شانۆی کوردی، گۆڤاری رامان، ژ(١٠)، هەولێر: ١٩٩٦، ل ٦-١٤.

٨- گۆڤاری ژین ، ژمارە(٢١)، ئەستەمبۆڵ: ١٩١٩، بەرگی دوواوە.

(9): Abdurahim ZAPSU: Diroka Islame ya Mezin(Buyuk Islam Tarihi. Wesanxana Sebil, Stanbol: 1975.

١٠- د. فەرهاد پیربالّ: ئەو نووسەرەی بۆ یەکەمین جار شانۆنامەی هێنایە ناو ئەدەبی کوردییەوە، رۆژنامەی(برایەتی)، ئەدەب و هونەر، ژمارە(٧١)، رۆژی ١٩٩٨/٤/٣، ل ٨.

(11): Jin, Cild I, R.27.

(12): H. KILIC: E.R.Hekari, R.18.

(13): D-Farhad PIRBAL OMAR: Les Sources de la Nouvelle Kurde, Memoire de DEA, Paris 111. Paris: 1990. p.23-29

(14): Hamit BIZARSLAN: Traditionalisme ou Nation-

alisme, in CEMOTI, N.6, FNSP.
Paris: 1988. p.35-52.
(15): Les Kurdes et Le Kurdistan, Sous Le direction de Gerard CHALIAND, Ed. PCM., Paris: 1981, pp. 42-53.
(16): Christione MORE: Les Kurdes anjourd, hui, Ed. L, Harmatan, Paris: 1984. pp. 47-62, 286.

١٧- البروفيسور م.أ. هسرتيان: كردستان تركيا بين الحربين ترجمه: د. سعدالدين ملا و باقى نازى، نشورات رابطه كاوا للشقافه الكرديه، دارالكاتب، بيروت: ١٩٨٧، ص ١٣-٦١.

١٨- د. جليلى جليل: نهظه الاكراد الثقافيه، ت: ولاتو، دمشق: ؟. هەروەها د. عبدالستار طاهر شريف: تاريخ الاحزاب و المنظمات الكورديه ١٩٠٨-١٩٥٨، شركه المعرفه. بغداد: ١٩٨٩.

(19): M.E.BOZARSLAN. Jin, Cild 1, R. 8-10.
(20): Farhad OMAR: La Genese de La Nouvelle Kulde. These de Dictorat, Sius La direction de CH.H. DE FOU-CHECOUR, Paris 111. Paris: 1994, pp. 42-47.

٢١- حەمید بۆزئارسلان لە تورکییەوە کردوویەتیە فەڕەنسی، بڕوانە
Hamid BOZARSLAN: Le Probleme national Kilde, Memoire de l, E.H.E.S., Sous La direction de M. robert, paris: 1986. pp. 138-140.

٢٢- د. فەرهاد پیربالّ: ع. ڕەحمی هەکاری، ئەو نووسەرە نوێخوازەی کە بۆ یەکەمین جار شیعری ئازادی هێنایە ناو ئەدەبیاتی کوردییەوە، ڕۆژنامەی (کوردستانی نوێ)، ژمارە(٨٩٢)، هەولێر: ٦/١١/١٩٩٤.

(23): Alessio BOMBACI: Histiire de La Litterature turque, paris: 1968, p. 3-5.
(24): Ahmed HACHM: Les tendance actulle de La Litterature turque, Mercure de France, N.627, paris: 1924. pp. 641-655.

حوزەیرانی(١٩٤٩).

٢٦-هەموو ئەم نووسەرانە لە گۆڤاری(ثروت فنون)دا بەشداربوونە. هەمان

سەرچاوەی پێشوو.

٢٧- پیرەمێرد، رۆژنامەی(ژین)، ژمارە(٨٩٣)، سلێمانی: ١٩٤٧.

(28): H.KILIC: E.R.Hekari, R 53-54.

(٢٩) رەفیق حیلمی: شیعر و ئەدەبیاتی کوردی، چاپی نوێ: مطبعە التعلیم العالی، اربیل: ١٩٨٨، ل١٤٨.

(٣٠) د. فەرهاد پیربال: ه. رەحمی هەکاری، ئەو نووسەرە نوێخوازەی کە بۆ یەکەمین جار شیعری ئازادی هێنایە ناو ئەدەبیاتی کوردییەوە، رۆژنامەی (کوردستانی نوێ)، ژمارە(٨٩٢)، هەولێر: ١٩٩٤/١١/٦.

ئەم شیعرانەی لێرەدا بەرچاویان دەخەین، بریتین لەو شیعرە نەوبینانەی ع. ڕ. هەکاری (١٨٩٠- ١٩٥٨)، کە چەندین ساڵ پێش شێخ نووری شێخ ساڵح و گۆران «ئاڵای تازەکردنەوەی» بەرزکردۆتەوە و ئەم شیعرانەی لە ژمارەکانی گۆڤاری ژین (ئەستەمبۆڵ: ١٩١٨- ١٩١٩) بڵاو کردۆتەوە.

ئێمە بۆ خستنە سەر ڕێنووسی کوردیی ئەمڕۆ، سوودمان لەم دوو ساغکردنەوەیەی خوارەوە وەرگرتووە کە لە دەفری ڕێنووسی کوردی بە لاتینی ئەنجام دراون. پێویستە ئاماژە بۆ ئەوەش بکرێ کە کاتی خۆی، لە ساڵی ١٩٩٩دا، دووای ئەوەی ئەم بیست پارچە شیعرەمان لە ژمارەیەکی گۆڤاری (رامان)دا لە هەولێر بڵاوکردەوە، برای بەڕێزم، شەوکەت سندی، دووای چەند مانگێک، ئەم شیعرانەی لە توێی کتێبێکدا بە چاپ گەیاند، بێ ئەوەی ئاماژە بە کارەکەی پێشووی من بدات.

شیعری بیست و یەکەم، بە ناونیشانی ( شەهیدێ کوردستان .. حەمزە) کە بۆ نووسەری شەهید، هەمزە بەگ مۆکسی نووسراوە، لە ٦ی گوڵانی ١٩٢٠دا نووسراوە؛ لە گۆڤاری ژین دا نییە.

(1): Jin (1918- 1919), M.E. BOZARSLAN, 4 Cild, Wesanxana Deng, Uppsala: 1985- 1987.

(2): Hazim KILIC: Evdirehim Rehmiye HEKARI, Wesanxana Xaniu Bateyi, Danmark: 1991.

# بانگ

هشیار بووم ئەز، دنیا هەمی کەر
ب دەنگێ مەلایێ «ئەللاهو ئەکبەر»

«ئەللاهو ئەکبەر» دەنگێ منارێ
«رابن» دبێژت، هەر وەک هەوارێ

«رابن» دبێژت، وەقتێ سبێیە
ساحب خەباتان، شەیتان ل پێیە

مەغلووب نەبن هوون ژ دەستێ لەعینێ
بۆنا خوەدێیە، رابن بچینێ

پاقژ بکەن خۆ ژ کێمێ و قرێژێ
حازر ببن هەم بۆنا نڤێژێ

حازر ببن وه عه‌فوا قوسووران
کو خالقێ وه، وه دخوازت دیوان

وه‌خت ته‌نگه، له‌زکه‌ن، بگه‌هنه مزگه‌فت
ل په‌ی مه‌لاییی، هێژ رۆژ نه‌ده‌رکه‌فت

ئه‌مرێ خودێ خوه ئه‌م پێکڤه بینن
جا خه‌لق نه‌بێژت «بێ حس و دینن».

(٢٤)ی چریا ئه‌وه‌ل (١٤١٤) ژین ژماره (١) ل(١١) ئه‌سته‌مبۆل (٧)ی
چریا پاشین (١٩١٨)

# قەوی ب خارنا زەعیفان دژین

سبێ وەکی چوومە خەبات
قژکەک م دیت، چۆلێ دهات
کورمەک دناڤ دەڤکی ڤەشارت
لەز بوو، ب هێلینێ ڤە هات
شاهیانە بوو کەفتە وەلات.

زاریێ ئەوان ئێک قژ قژی
کورمک کو کەر کر وی قژی
تەقسیمێ زاریان کر قەژی
خوارن ئەوان، بوون تێر تژی
چووچک ب وێ «نێچیر» دژی
کوشتن نەبا، نێچیر نەدهات.

ژینا قژک ب مرنا وییە
کورمک نەبیت، قژ برسییە
برسی، حەیات رۆژا سییە

ژ خێرێ سیان مومکن نییه
ژینا ئەوان ب نێچیرییه
لەورا کو کورمک کوشت، هلات

کیژکا قەوی، نێچیرڤان
کیژکا زەعیفه، بێ ئەمان
کوشتن ژ بۆ بێ قودرەتان
خەلق کریه خالق، قەنج بزان
گەر ژین دخوازی ڤی زەمان
قووەت تەڕا ژین و خەبات.

---

چریا ئەوەل ٣٣٤ (١٩١٨).

# عەشقا وەلات

بوهار هات، شین بوون گیا
جل بەرکرن، خەملێن چیا
گەشتان بکەن سەر کانیا
ژ خیزێ دچت شبهێ زیا
بەراق و پاک و سافیا
عەشقا وەلات، عەشقا وەلات
تە جەرگ و مێلاکێ مە پاهت

جارەک دی من دیبا خوەزی
کۆنێت د رەش، گەریێت د پەزی
تۆ ماست لُ سەر ئاڤێت تەزی
زەریێت وەکی سرمەکەزی

ل بێریێ ل پەی بزان دبەزی
عەشقا وەلات، عەشقا وەلات
تە جەرگ و مێلاکێ مە پاهت

بۆچی ژتە ئەم بوون جودا
مە تەرک کرن لەززەت، سەفا
شاهان کووچە دانە گەدا
هاتن ل بن خانیێ مەدا
تەرکا تە کر بۆنا خوەدا
عەشقا وەلات، عەشقا وەلات
تە جەرگ و مێلاکێ مە پاهت

کانێ وەلاتێ سەرحەدان
سۆتن ئەوان ئاتەشگەدان
لەورا کو گۆر بوونە شڤان
دەنگێ بلوولان، نالییان
دەنگێ هەواران، گازییان
عەشقا وەلات، عەشقا وەلات
تە جەرگ و مێلاکێ مە پاهت

دەنگەک تونە، شۆلەک عەجیب
ئەم مانە سەرگەردان، غەریب
دوور بوون ژ وەلاتێ دلڤریب

جارەک دی دێ ببتە نەسیب
چوون ل وێ رەببێ موجیب
عەشقا وەلات، عەشقا وەلات
تە جەرگ و مێلاکێ مە پاهت

دبێژن وەلات بۆ دژمنە
ئەز ساغ ببم قەت ممکنە!
غیرەت، حەمییەت زامنە
عەشقا وی مێهڤانێ منە
قوربان ژوی را مەرگێ منە.
عەشقا وەلات، عەشقا وەلات
تە جەرگ و مێلاکێ مە پاهت.

---

(١٧)ی چریا پاشین ٣٣٤ (١٩١٨) ژین ژمارە (٥) ل(١٤)،
ئەستەمبۆل

## دەستێ تەنێ دەنگ ژێ نایەت

ئەی مللەتێ ساحب نیفاق
لازم ژ بۆ تە ئیتتیفاق
تەئسیس نەکن ئەم یەک ویفاق
مەحوبیەتە بیلئیتتیفاق؛
عەقلێ خوە بەرهەڤ کەن هەمی!

وەخت زەمان پڕ نازکە
بێ ئیتتیفاقی تەهلوکە
خەلکان هەمی دگەل مە رکە
مەحوبیەتا مە بێ شکە؛
عەقلێ خوە بەرهەڤ کەن هەمی!

شەخسییەتێ باڤێنە دەر
یەک شەخسی شۆل نایێتە سەر
یەک بن نەمینت بێ ئەسەر
شۆلا ئومیدا مە ل سەر؛
عەقلێ خوە بەرهەڤ کەن هەمی!

دەست دەنە یەک شبهێ برا
هەلکەن ژ بۆ خوە یەک چرا
ریا کو تارییە ژ مەڕا
رۆناهی لازم ڤێ سەرا
عەقلێ خوە بەرهەڤ کەن هەمی!

سەلایا شەڤ

گەلۆ رابن، زەمان تەنگە
خەوا جەهلێ وەها رەنگە
مەحووکرنا وی بێدەنگە
تەمەت حالێ کەوێ شەنگە
خوەدایا ، دژمنان جەنگە؛
ژ خەو ئەم تێر نەبوون یا رەب!

خەوا غەفلەت زەباندن ئەم
ژ ڤێ عەمرێ رەڤاندن ئەم
ژ بۆ جەهلێ خاپاندن ئەم
ژ دنیایێ تەفاندن ئەم
د بن زولمێ جڤاندن ئەم
ژ خەو ئەم تێر نەبوون یا رەب!

هەتا کەنگی خەوا غەفلەت؟
هەتا کەنگی ژ مەحوییەت،
ژ برسیتی بچووک، کوفلەت
مەحوو بت هەموو میللەت
ژ خەو ئەم تێر نەبوون یا رەب!

---

(١٢)ی چریا پاشین ٣٣٤ (١٩١٨) ژین ژمارە (٥) ل(١٤)
ئەستەمبۆل: ١٩١٩

ئەگەر میللەت هەموو بخوینن
ئو ئەمرێ حەق کو جێه بینن
ئو تۆڤێ رەحمەتێ بچینن
وەکی عالەم خودان ژینن
ژ هەمیان چێترن، دبینن
ژ خەو ئەم تێر نەبوون یا رەب!

# ژ بۆ نەسلا تێت

سەعدۆ!
گەرچی تو بچوکی، ناتەوانی
لاکین سبەهێ تو قەهرەمانی

ئیرۆکە تو شیرمژی، بچیکی
پاش پازدەیی جانفیدا پەییکی

ئەز دێ بمرم، بچم ژ دنیا
لازم وەتەنی بکی تو ئیحیا

هیڤی یا من توبی کو ئەز دبێژم
دەرد و ئەلەمان هەموو درێژم
ئەم میللەتەک جەسوور و شوجعان
ساحب شەفەقەت و موحیببێ ئینسان

ئەسلی و نەجیب، هەموو زەکینە
لاکین د دنێ، مە هەق چو نینە

چونکی مە علووم، فەن، سینعەت

(٢٦)ی چریا پاشین ٣٣٤ (١٩١٨) ژین ژمارە (٦)، ئەستەمبۆل (١٩١٩)

هێلانە دناڤ گۆڕا جەهالەت

فیکرا مە عیلم کو سەرف و نەحون
ب ئەلوانێ فنوون سەفیل، مەحون

خیزان و فەقیر و بێ تجارەت
گۆیا کو فەقیری بۆ مە ریفعەت

بێ دەوڵەتی فەخرەکە ژ بۆ مە
هێ یا مە بە موسریفی نەدۆمە

کیسکێ مە ڤەکرییە، بۆ زیاعات
بۆ مەنفەعەتا عموم، هەیهات

گرتییە، ب سەد بەنان شداندی
بێ هیممەتێیە کو ئەم زەباندی

سەد زێڕی ب سفرەکێ زیافەت
ئیسراف دکن ژ بۆ سەفاهەت

سەد پارە ژ مەدرەسێ، قەباحەت
خاسما ژ بۆ مەکتەبا سەعادەت

دەستێ مە ڤەکرییە، پڕ سەخینە
بۆ مەنفەعەتا عموومی نینە

تەنێ ژ بۆ ناڤەکی موجەڕڕەد
بۆ مەنفەعەتا خەسیس و هەم بەد

**١) سەعدۆ خوارزایێ منە.**

# بۆ هێڤی نەبن

بێ هێڤی نەبن ئەسلا
ژێ مەرحەمەتا مەولا
قورئانێ (عظیم الشأن)
«لا تقنطوا» گۆت لەوما.

سەعی و ئەمەلێت جیددی
مزگینییە بۆ ئەعمال
خاسما نیەتەک سافە
ئەفرادی هەموو فەعال.

هەر کەس د وەزیفا خوە
لازم خەبتن شەڤ - رۆژ
یەک سانیە بێ فێدە
زایع دکەتن سەد رۆژ.

زەحف بوونە رەقیبێت مە
وێ دخەبتن دایم
ئیمان کریە هەموویان

---

(٣)ی کانوونا پاشین ٣٣٥ (١٩١٩) ژین ژمارە (٨) ل(١٦ - ١٨)، ئەستەمبۆل (١٩١٩)

تەوفیق ب ما قایم.

ریبیا مە نها گرتی
ریبیا هەقە، بێ پەروا
تەسدیق دکەت هەر کەس
هەم رازییە پێ مەولا.

فەکرن خەبەرێ پیران
پاشی سەعی و تەدبیران
«خوەدێ ب مەڕا یار بی
شوورێ مە بلا دار بی».

# دەنگ

دەنگەک ژ خرابا وەتەنێ من دکە گازی
دەنگێ چیە؟ ئەو کوندە وەیا تەیرەکێ بازی؟

یان دەنگی هەتیمانە لبەر باگەر و بەفران
ژ سەرمان لەرزن، بێ جل و سۆل ماینە، تازی؟

بێ خارن و زادن، هەموو برسینە، سەفیلن
ژینا خوە پەشیمانی، هەموو مرنەکێ رازی

پەز چوونە، دەوار مرنە، ل کوو ما دەو و رێچال؟
گامێش مرنە، گێسن، جۆت، نیر، برازی!

ناڤ ئاگرێ زوڵمێ هەموو سۆتن، نهە بێ شوون
گەردوون، عەرەبە، مالێ، شەنە خوەلیەکێ تازی

---

(٢٨)ی کانوونا پێشین ٣٣٤ (١٩١٨) ژین ژمارە (٩) ل(١٤)،
ئەستەمبۆل (١٩١٩)

بەلکی خوەلی ژی باگەرەکێ ئانی بەلاڤ کر
دەعوا چیە ؟
مەزنوون کیە ؟
ما قەی هەیە
قازی ؟

# نالینا سێویکێ

ئەز مامە سێوی بێ دا و بابم
خانییێ م سۆتن، ئەز مالخزابم

بابێ م کوشتن بێ دین کوفاران
موحتاجم ئیرۆ دەستێ نەیاران

گورگێت دوو پێ هاتن، کەتن کەرییان
موهاجیرم ئەز وێ کەتمە دەرییان

نانەک دخوازم ژ بۆ ڤەژینێ
رەحمێ ب م ناکەن ژ غەیرێ کینێ

ئینساف بکەن ئەی ئەولادێ ئادەم
ئەز ژی مرۆڤم، قەت خوە ب وە نادەم

وەختێ زەماندا ئەز خانەدان بووم
جهێ خوەدا ئەز ساحیبقران بووم

---

(٢)ی شوبات ٣٣٥ (١٩١٩) ژین ژمارە (١٥) ل(١٢)، ئەستەمبۆل (١٩١٩)

رۆژێ دو سەد مێر من بوونە مێهڤان
دایم تژی بوون من دەرگەهـ، دیوان

ژ گۆشت و برنجان سفرە دەرتێخست
مەمنوون، مورەففەهـ من رێ دیەخست

ئیرۆ من عارە ئەز بەحس ژ وێ بکم
دنیا وە بۆراند، ئیرۆکە چ بکم؟

# حي على الصلاة

دەنگەک ژ منارێ تێت
گازی دکەتن مەللا:

وەقتێ خوە نەکەن زایع
رابن ژ خابێ جا

ناڤێ خودێ خوە بینن
غەفلەت نەچن مەحزا

ئیبلیس نەبت غالیب
قەلبێ مە نەکەت مەئوا

قەلبێ مە بکەت تەسخیر
ما مومکینە ژین؟ ئەسلا!

هشیار بن، رابن

ژین ژمارە (١١) ل(١٢). (١٠)ی شبات ٣٣٥ (١٩١٩)

دژمن نەکەت ئیستیلا

## تەبریك

ب موناسەبەتا سەرسالێ، جوملە کوردان تەبریک

دکەن و رۆژ و شەڤ خێر و سەعادەتێ ژ بۆ وەتەنێ خوە ژ یەزدانێ پاک نیاز دکەن.

سەرساڵ

مە کوردان عیدەکێ قالە
دلۆ شا بە کو سەرسالە
د مێرگان سۆسن و لالە
گولان وێ گرتیە ژالە
تەبیعەت سامت و لاڵە
ژ خەملان رۆح، جان والە
تەنێ دەنگەک.... ژ کوو دنالە؟
عەجایب.... بلبلە د کالە!؟

نەکو بلبل دکەت ئەفغان
نە خێر! ئەو نەعرێیا لاوان
سوارن جوملە سەر ئەسپان
ژ بۆ رمبازی و مەیدان
جریدێ بکن وەکی شێران
کو رۆژا شادی یا کوردان

(١٢)ی ئادار ٣٣٥ (١٩١٩) ژین ژمارە (١٣) ل(١٤)، ئەستەمبۆل (١٩١٩).

بزانن ساحیبێت ئیزعان
نه عیده، بەلکی سەرساله.

## نوور

ئەز تەماشا دکەم، وەلاتێ من تەمام باخێ گولان
چار تەرەف بێدەنگ، سامت بوون ژ نەغما بلبلان

ئالیەکی بێهنا بوهارێ، ئالیەکی دەنگێ حەزین
جۆ و جۆباران گەوری ئێخستنە ئاڤا شرین

خوش – خوشا ئاڤێ دگەل فەسلا دبێژیت عەندەلیب
ساقیا، مەجلیس تەمامە، مەست ب ئاڤا زەبیب

پەلک هەمی شەرمندەنە ژ حوسن و جەمالا گولشەنێ
قەترە قەترە خوە دڕێژن، وەک خوناڤا گەردەنێ

ئەو حەقیقەت دا زەریفە، قابیلێ تەسویر نیە
سەد ئەسەف موحتاجێ تەنویرە، کو لەوما تارییە

لازمە هەلکەین چرایەک ژ شوعلەیا «هل یستوا...»
جوملە مەجبوورێ خەباتێ نە ب ئەمرێ «اطلبوا..»

## نەزانین

(٩)ی ئادار ٣٣٥ (١٩١٩) نەورۆز ژین ژمارە (١٤) ل(٢٢)، ئەستەمبۆل (١٩١٩)

ئەی جەهل و نەزانین، تویی دژمن، تویی خائین
زولما تەیە هێلان هەمی بێ سەنعەت و بێ دین

قەهرا تەیە وێرانە کری ئاه... وەتەنێ من
کینا تەیە بێ لانە کری جیسم و تەنێ من

سەروەت تە ژ مە ستاندییە بێ ماڵ و دراڤن
ئەم ماییینە بەلەنگاز و فەقیر، خانە بەلاڤن

دەردێ تەیە مەعلوول کری، ئەم خوە نەزانین
ئەم کینە؟ کوڕێ کێنە؟ ئەم ئێخسیر و گاڤانین؟

یان ئەم ژی خوەدان شان و نەسەب، قەومێ نەجیبین؟
بەهرا مە هەیە، ئەم ژی خوەدان بەهر و نەسیبین؟

دنیا وەکی چێکر خوەدێ، بەهرا مە ژی دابوو
لاکین ژ نەزانین و جەهل، کانێ؟ فیدا بوو.

---

(٢٦)ی ئادار ٣٣٥ (١٩١٩) ژین ژمارە (١٥) ل(٢٢)، ئەستەمبۆل (١٩١٩)

# مرۆڤینی

سەعدۆ! گۆ هەبی کوڕەک کێم ئیزعان

گۆتی «کوڕێ من، تو نابی ئینسان»

ئەو گۆتنە لێ قەوی گران هات
رابوو عەنری، عیناد ب عەیان هات

دەرکەت ژ وەلاتی، وی سەفەر کر
لەوما خەبەرێ د وی ئەسەر کر

عەهدکر، بچتن ببت قوماندان
یان والییەکی ب حشمەت و شان

ئەو چوو خەبتی، د مەکتەبان خوەند
جا پاشڤە نەمینت عەهد و پەوەند

لەوما نەدخوەست ببیتە عالم
نییەت هەبوو ئەو ببیتە زالم

چەند مەکتەبەکان وەگرت وەسیقە
تالع کرە والی، بێ سەلیقە

(٢)ی نیسان (١٩١٩) ژین ژمارە (١٧) ل(١٦)، ئەستەمبۆل (١٩١٩)

بەرکرییە ژ زێڕ جلێد موزەییەن
ئەو حاکم و واڵییە موعەییەن

گاڤا زڤڕی، گهشتە باژێر
ئەو جاهیل و ئەحمەقێ کو بێ خێر

ئەمرەک ژ خوە دایە بۆ قوماندان
بابێ خوە هەمان هاڤێتە زندان

رۆژا دیتر ئاینە حوزوورێ
ئەو تەحلە خەبەر ئینانده بیرێ:

– بابۆ! نە تە گۆت «تو نابی ئینسان»
والی مە، د ملکی دا حوکمڕان

– حاشا .... من نەگۆت «تو نابی والی
بەلکو ژ مرۆڤینیێ تو خالی».

# لۆمه ژ بلبل

بلبل، چییه نالی یا وه هەردەم!
یان هوون ژی وەکی مه بێ وەلاتن؟
حاشا ، نه وەکی مه هوون سەفیلن
«هێلوون»وه هەیه ، خوەدان کەلاتن
هون عاشقێ سۆرگولان هەبینن
دلخوازێ مه مەملەکەت، کەلاتن
ماشووقێ وه گولن، مه گولستانن
گازی وه دکر، مه دل دپاتن
عەشقا مه نه وەکا وه دیتنا گول
یان تالیبێ ژین- یان مەماتن
هون ئەگەر بگرین، ئەگەر بنالن
هون ئاشقێ زار، بێ سەباتن
هاڤین، بوهار، دکەن فغانێ
زڤستان ل وه تێت، بێ خەباتن
لەوما نه وه گول دما ، نه ماشووق
وەختێ وەکوو بەرف و سڕ دهاتن
دلخوازێ مه هەر هەنه ، کو گوندن

---

(٥)ی نیسان (١٩١٩) ژین ژماره (١٨) ل(١٦ – ١٧)، ئەستەمبۆل (١٩١٩)

بازێر، رەزن، هەمی وەلاتن
یەزدان وەکی ئافراندی ئەو جی
گۆتی «هەبە» ، مەزهەرێ سیفاتن
پۆلا وەکوو سەر کەزەب دسۆژت
ئاگر ژ ئەڤینا وەلاتن
ئەو ناڤەمرن ب بەفر و سەرمان
عەشقا خوەدا ئەم خودان سەباتن.

## ژ بۆ شەریف پاشا

دیسا ژ شەجاعەتا تە ئەی خان

دەرییەک ڤەبوو ژ بۆ مە کوردان

ئێدی بەسە ئەڤ جەفا و زیللەت
بێ عیلم و فەزل بمنینە میللەت

ئەڤ عەسرە بلندییێ دخوازت
هەتا وەکو ژین چیە، بناست

فەخرێ دکەین ئەم ب تە، تو کوردی
ئەلهەق کو تو مێری، هەم تو مەردی

پشتا تەیە جوملە کورد، کورمانج
لەورا کو تە حەق کرییە ئارمانج

کورمانج هەقیقەتا شینانە
لەورا کو د وێ رێێ دا فیدانە.

## ژ بۆ جڤاتا دایکان

---

(١٥)ی گولان (١٩١٩) ژین ژمارە (١٩) ل(٢٠ - ٢١)، ئەستەمبۆل (١٩١٩)

پرسی ژ عەسرێ دەوران: «فەن و تەرەقییا تە
دەوڵەت سەرێ چییە؟» گۆت «دەولەت سەرێ
ژنانە»
لەورا قە ناحەون ئەو، شەڤ و رۆژ وان خەباتە
جا زارییەک مەزن کەن؛ ژینا وەلات ب وانە
ئینسان بە ئەسلێ فیترەت نە قەنجە، نە خرابە
قەنج و خرابی یا مە ب راکرنا دییانە
ئەمرێ رەسولی: «جەننەت بن پییێ ئوممەهاتان»
لەورا دەها، زەکاوەت ب تەربییا ئەوانە
عیلم، فەزیلەتا وان هندی بکەت تەرەققی،
تەجهیز بن موکەممەل ب ئەخلاقێ مادەرانە
ئەم دێ بلند بین هندێ، هەتا بگەهینە ئەو جان
وەختێ فەلاحبوونێ، زەمان ژی ئەڤ زەمانە
گۆتن ڤەکرن دایان جڤاتەکێ بلندی
یا رەب تو پێکڤە بینە، تەوفیقەکێ دە وانە
رەحمی نەدیت کو لایق تەقدیم بکەت هەدییە
هەدییە ئەگەر قەبوول بت وی دایە جسم و جانە.

---

ژین ژمارە (٢١) ل(١٥ - ١٦)، ئەستەمبۆل (١٩١٩)

# گازیا دویماهیکێ

رابە ئەی کوردێ ژ کوردان
سەر ژ ئێخسیریێ هلین
داوەشە ژ تۆز و غوربارێ
عیلم و عیرفانێ ببین.

دێ هەتا کەنگی خولام بی
تو د بن پشتییان حەمال
شەڤ مە بۆراند، رۆژ دەرکەت
رابە جا ئەم بچینە مال.

مالا من گۆتی خرابە
تێ نییە باب، برا
هندەک ئێتم ماینە شەڤێ
د تاریێ دا، بێ چرا.

**فیرقەت**

---

ژین ژمارە (٢٢) ل(١٦) ئەستەمبول (١٩١٩)

هاتفی وی گۆتە من: هیجرانە، زوو کارێ خوە کە
ئاشقان سەر بر گرینە، رۆهنیان ب نارێ خوە کە

رۆهنیان ب ئاگر برێژە، دا نەسۆژت عالەمێ
دەرعەقەب چاڤان جهاب داییێ، مژان کەتنە خەمێ

کانییا دەردان کو دەر بوو، جو و جۆبار کەتنە روو
رەنگێ سیماییێ ملەووەن گاه سپی، گاه زەر بوو

من نەما تاقەت، هەردەم رۆحێ مەدهووش بێ خەبەر
ساعیقا هیجرێ کو ڤێکەت، من نەما ژ ژینێ ئەسەر

شێنییا رۆییێ ل مەگرت تارییا د شکلێ مەدا
وان د ناڤبەینا خوە چێکر، قەت رۆحی ئەمرەک نەدا.

## ویسلەت

(٨)ی تیرمەه (١٩١٩) ژین ژمارە (٢٣) ل١٧ ئەستەمبۆل

چوومه وەلاتی، حالەک حەزین دیت
دایکا خوە ڤێ جار ب خوین، برین دیت

گوهان زوها بوو، دایکا بریندار
نەشییا خوەدان کەت مندال، بچووک، ژار

چوومە ل سەر، من زێن دا برینێ
رۆهنک رەشاندن، بەردا گرینێ:

دادێ، تە خێرە! گێسوو بەلاڤی!
کانێ ژ تە نایێت بێهنا گولاڤێ

گاڤا تو قیز بووی بسکێت پەریشان
تۆزێ پیێچایە خال، نیشان

دەستێ خوە نادی راموستن، گور
شەفقەت، مەحەببەت راکر، تە بیرکر

پێنج سالە ئیرۆ ژ تە جودا بووم

---

(٢٥)ی تیرمەه (١٩١٩) ژین ژمارە (٢٤) ل١٧، ئەستەمبۆل (١٩١٩)

دیل بووم، بریندار. هاتم، خۆیا بووم

ئەڤە ڤەگەڕیام، هاتم حوزووریٚ
گەر دیٚ هەبیتن، بەخشە قوسووریٚ

دەنگیٚ م گوهـ کەت، چاڤیٚ خوە راکر
ڕۆهنک نەمابوون، خوین ژیٚ ڤالا کر

گۆت: ئەی کوڕیٚ من، ب خێر تو هاتی
تو ل کیٚ دەریٚ بوو، دوور بوو ژ وەلاتی؟

پاش کو تو چوویی، دۆست بوونە دژمن
هەر دو دگەل یەک ڕابوونە سەر من

ئینساف نەمابوو، دین بیرکرن وان
خوارن، ڤەخوارن خوینا مرۆڤان

تالان کری nامووسان ژ قیزیٚ
سەر ژیٚ دکرن وان بۆنا لەیزیٚ

* * *

ئەز چوومە باخان: بیٚ دار، دوور بوون

مەشییا مە راخان؛ بێ هەسپێ گەور بوون

من گۆتە بلبل: ما گول تە دەر دا؟
من دی کو کوندەک دەرحال جەواب دا:

کا بلبلێ ژار! قا دین بوویی تو
سەرحەد خرابن، پێنج سالە ئیرۆ

سۆتن، قەلاندن باخ و گولستان
سۆر گول نەهێلان، بلبل نەوەستان.

## شەهیدێ کوردستانێ.. هەمزە

رابە ژ خەوا خوە، حەمزە، رابە
خوینا تە نەچوو هەبا تو شابە

ریبیا ڤی وەلاتی دا شەهیدی
لەورا تو موجاهیدەک سەعیدی

رابە هەرە پێش لقایێ یەزدان
ب خوینا دچیتن ژ وان برینان
سۆرکە کەفەنێ ب رەنگێ ئالان

---

حەلەب: ٩ی تەباخ ١٩١٩

مەزلوومی بکە تو عەرزی ئەحوال

بێژە: تو عالمی بێ میسالی
بێژە: تو سەمیعی لایەزالی

زلما مە هاتی تو دزانی
لەورا تو قادر و (کن فکان)ی

باژێر و کەلات و خان و مان چوون
بێ شوکرێ تە ناچتن مەدانەک

حاشا تو نە زالمی نیکووکار
ئەم جاهل و بێ خەبەر گونەهکار

دەردێ ڤێ جەهالەتێ دکێشن
ئەو عللەتە ئەم ژ بەر دئێشن

دۆستێ دمە وەک شەیر دوژمن
صادق مە نەدی برایێ موئمن

دوژمن وە هەیە بکت مەحەببەت
هەتا نەچتن ژ مە جەهالەت

ئەم موعتەریفی بەتالینە
ما غەیری تە ئەم عەبیدێ کینە

ئەلبەت ل گەل ئیعتراف و نوقصان
دیسا ژ تە دێ بخوازن ئیحسان

ما دەم خولقاندن ئەم تەمللەت
لازم ژ مە ژی هەبت حکوومەت

داخوازێ بکەن ژ تە تەبایی
لەورا تو (تعز من تشا)یی

تو حەز بکی دێ ڤەبت سەعادەت
دێ هل ببتن شەمالێ مللەت

خوین دێ بکەلت ببت حەمییەت
حەتتا کو نخمینن جەهالەت

گلیێ تە بەلێ خودایێ موطلەق
دێ بێتە جھ ئەی شەهیدێ ناحەق

تو بەرزە کرن ب جەبرێ تەهفیر

مەعصوومی د تە نەمایە تەقصیر

ئیرۆ من دخوەزت بگهێمە (ژین)ێ
تاقەت من نەما ژبەر گرینێ

مەولا تە ب رەحمەتا خوە شاکت
خوینخوار و سادیان ژ مە جودا کت.

## فەرهەنگۆک

قژک: باڵندە

کورم: کرم

شەهیانە: شاهی

چووچک: چڤیک، چۆلەکە

کژ: کژک،کیژک، باڵندەیەکی کلک درێژە.

مێلاک: کەزەب

پاهت: پاهتن، پەتن، سووتاندن، پەستن.

کۆنێ ڕەش: ڕەشماڵ

کەری: گەمار، قرێژ.

سرمەکەزی: کەزیی بادراوی بەسورمە

گور: گورگ

شبهێ: وەکوو

زەباندن: لەهێزخستن

ڕەڤاندن: دوواخستن

---

١٧ی گوڵان ١٩٢٠

خاپاندن: هەڵخەڵەتاندن

تەفاندن: رەشبوونەوە

تۆڤ: تۆو

کوور: چاڵ

خیزان: هەژار

کیسک: کیسە

شداندی: گرێدراو

زەباندن: لە هێزکەوتن

ئەسلا: ئەسڵەن، هیچ

فەکرن: بیر بکەنەوە

باگەڕ: باهۆز

ریچاڵ: پێخواردن، پێخۆر

مەحزا: بەڵام

قالە: گوتراوە

شا بە: شاد بە!

ئیزعان: قبوڵکردنی هەق

عەندی: خەیدی، سلبوو.

پەوەند: پەیوەندی

کەلات: قەڵا

قه: هەرگیز

ناحەون: ناحەوێنەوە

ڕۆهنک: ڕۆندک

جهاب: بەرسڤ

ساعیقا هیجرێ: برووسکەی لێک جودابوونەوە.

شێنی یا ڕۆیێ: شایی و گەشیی ڕۆژ

گوهان: چۆلەکەی ناو هەیوانان

زێن دا: زەینم دایە، سەیرم کرد

رۆهنک: فرمێسک

قیز: کچ

پێچاوتیە: پێچاوە

لەم بەشەدا هەوڵدەدەین یەکێک لە سەرچاوەکانی پێکهاتنی شانۆی کوردی دەسنیشان بکەین کە چۆن لە ماوەی کۆتایی چارەگی یەکەمی سەدەی بیستەمدا لەژێر کاریگەرێتیی کولتووری ئەورووپا و نووسەرە گەنجە تورکەکانی ئەستەمبۆڵدا، وەک ژانرێکی رۆژئاوایی، لەسەر دەستی عەبدولرەحیم ڕەحمی هەکاریی گەنجەوە

دێتە ناو ئەدەبەکەمان و مۆرکێکی نەتەوەیی بەخۆیەوە دەگرێت.

زاراوەی " شانۆ " لە زمانی نووسینی کوردیی سەدەکانی کۆندا بەدی ناکرێت. بۆ یەکەمین جار، مەحوی، لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا، زاراوەی تیاترۆی لاتینیی Theatre، بەم شێوەیە بەکارهێناوە:

دنیا تیاترۆیە، مەوەستە تیا، برۆ
کێ مایەوە کە نەبووبێ تیا ترۆ.

ئەمە، دوو راستیمان بۆ روون دەکاتەوە:

١ـ کورد تا سەرەتای سەدەی بیستەم هونەری شانۆی، بە واتا رۆژئاواییەکە، نەبووە و نەناسیوە. هەر بۆیەش زاراوەکە ـ بەو شێوەیەی کە شانۆی رۆژئاوایی دەربڕێت ـ لە زمانی کوردیدا دروست نەکراوە.

لە سەردەمی عوسمانییەکاندا لە هەولێر، بەپێی سجللاتی کۆن، وانەی " لیسانی فەرەنسەوی و مۆسیقا و رەسم و ئال ئیشلەری و تەربیەی بەدەنی و حوسنی خەت " دەخوێنرا. لەو تۆمارە کۆنانەدا هیچ باسێک لە هونەری شانۆ و تیاترۆ نەکراوە. ئەمەش بەڵگەیەکی دیکەی ئەوەیە کە تا سەردەمی ع. ڕەحمی هەکاری شانۆمان نەناسیوە.

٢ـ ئەگەر شانۆمان ناسیبێتیش یان شتێکی کەممان لەبارەوە بیستبێت، ئەوا هەر زاراوە لاتینییەکەمان بۆ بەکارهێناوە: تیاترۆ Theatre . ئەم زاراوەیەش، وەک لە قسەی ناو خەڵکیشەوە

دەردەکـەوێ، واتـای هونـەریی خـۆی لەدەست داوە و لەناو کـورددا گۆڕانی بەسەردا هاتووە، واتایەکی خراپی گەیاندووە. بە " ئافرەتی خراپ" و " شوێنی خراپ" گوتراوە " تیاترۆ". ئەمەش چونکە لەناو کورددا نەبینراوە کە ئافرەت بچێتە سەر شانۆ و نواندن پێشکەش بکات. هەروەها لە سەردەمی ئینگلیزەکانیشدا هەر زاراوەی تیاترۆ بەکـارهاتووە. بۆ نموونە لە سـاڵی ١٩٢٠دا لە لاپەڕە ٣ی ژمـارە (٥٥)ی رۆژنامەی (پێشکەوتن)دا، زاراوەی تیاترۆ بەکارهاتووە. هەروەها تەماشاچی بۆ متفرج بەکارهاتووە.

لە سـەرەتای سـەدەی بیـسـتـەم بەمـلاوە، وردە وردە، لەناو رۆژنامـە و گـۆڤـار و بڵاوکـراوەکـاندا، زاراوە ئەورووپاییـەکـان بۆ (هونەری شـانۆ) دەردەکـەون، وەکـو: پیـەس، درام، تیـاتر؛ یـانیش هەندێ جار زاراوە فارسی و عەرەبیەکان، وەک: نمایش، تەمسیل.

کـــەواتە، دووای وردبوونە و تۆژینەوە، دەردەکـــەوێت کـــە عەبدولڕەحیم رەحمی هەکاری یەکەم نووسەری کوردە کە بە زمـانی کـوردی لە سـاڵی ١٩١٩دا، لە گـۆڤـاری ژین، لە ژمـارە ( ١٥ و ١٦)دا، لە ئەسـتـەمـبـۆڵ، ناوێکی بۆ هونەری شـانۆ Theatre دۆزیبێتەوە. ناوبراو لە تێکستەکەی خۆیدا دوو زاراوەی بۆ شانۆ بەکـارهێناوە: پیـەس و " تیـاتر " . وەک دەبینین ئەم نووسـەرە مـۆدێرنیـسـتـەش هەر، نەیتـوانیـوە زاراوەیەکی کـوردیی پەتی دابڕێژێت؛ ئەویش هەر زاراوە لاتینییەکانی بەکارهێناوە. لەوانەشە هۆی ئەمە ئەوە بووبێت کە ویستبێتی هەر زاراوە لاتینییە لەناو

کورداندا بڵاوبیێتەوە.

پێش ئەوەی شانۆی هاوچەرخ یان نموونەی شانۆی رۆژئاوایی لە کوردستاندا بڵاوببێتەوە، کورد چەندین جۆر شانۆی میللی هەبووە. هونەری تەماشاکردن و پیشاندان، هونەرێکی دێرین و باوی کوردەوارییە. تەنانەت لە سەردەمە دێرینەکانەوە، بۆ نموونە: بەر لە زایینی مەسیح، گووتییەکان (٢٢٠٠ پ. ز) دەمامکی سەرکە بەرانیان لەسەر دەکرد؛ دیاردەی نواندن و لاساییکردنەوەیان لەلا هەبووە. میدییەکانیش چەندین جۆر شانۆی نەریتییان هەبووە. تەنانەت هەندێ لە پسپۆڕان وای بۆ دەچن کە هەندێک لە سوورەتەکانی گاتاکان (لە کتێبی ئاڤێستا) شانۆنامەیەکی تەواون.[١] هەروەها سالّی ٥٣ی پێش زاین، بە قسەی مێژوونووسی یۆنانی، سترابۆن، کورد و ئەرمەن شانۆیان هەبووە.[٢]

ئەم شانۆ میللییانە، بێگومان، لە شێوەی نووسیندا نەبوونە، بەڵکو تەنیا لە شێوەی تەدارەک و نواندندا پیشان دراون. دیارترین ئەو شانۆ میللییانە، ئەمانە بوونە:

١ـ یاری و گەمە میللییەکان

کورد، وەک هەموو گەلانی دیکەی رۆژهەڵات، یاری و قۆشمە و گۆڵمەزەکانی وەک قەرەگۆز و جریت بازی و مەیدان ئۆینی و ئۆرتە ئۆینی و عەرووسەک و زۆرخانە و کۆسە بەبە و بووکە بەبارانە

و ڕمبازی و رووبەندبازیی هەبووە.[3] ئەم گەمە و یارییانە بە جۆرێک لە نواندنی شانۆیی میللی دەژمێردرێن....[4]

٢ـ نواندنە مەزهەبی و دینییەکان

کورد لە نواندنە مەزهەبی و دینییەکاندا، کە پەیوەندییان بە پرسەی شیعەکان و کارەساتەکەی کەربەلاوە هەیە و زیاتر لە ئێران و تورکیای عوسمانیدا باو بوون، بەشداریی کردووە. سەردوولکە، کۆتەڵ (عاشوورا)، شیوەن.. لە گرنگترین نواندنە دینییەکان دەژمێردرێن. دیاردەی کۆتەڵ لە سەردەمی میدیایی و گووتییەکانیش، وەک تەدارەکێکی دینی و درامی، هەر هەبووە. پاشاکان بە کۆتەڵ نێژراون. لە داستانی مەم و زین دا مەم بە کۆتەڵ شاردراوەتەوە. زۆربەی ئەمانە گەنجینەی میتۆلۆژیای شانۆیی و نواندنی کوردین.[5]

٣ـ میرنەورۆزی و میرمیرێن

گەلی کورد هەندێ شێوە نواندنی شانۆیی تایبەت بە خۆی هەبووە، لەوانە: میرمێرێن و میر و گزیر و میرنەورۆزی.[6] میرمێرێن جۆرە نواندنێکی کوردەواری بووە، بەهاران کراوە. ئەم نەریتە هونەرییە پەیوەندییەکی هێندە پتەوی بە شانۆی ئەورووپاییەوە هەبووە کە مامۆستا گیوی موکریانی لە قامووسێکی خۆیدا وشەی میرمێرێنی بەرامبەر بە وشەی تیاتر Theatreی

ئێنگلیـزی و مـەسـرەحی عـەرەبیی داناوە.[٧] هەروەها لە سـاڵی ١٩٦٠یشـدا، لە رەخنەیەکی شـانۆییـدا ( چیـرۆکی شـۆڕشی هەڵواسـراوەکـان) نووسراوە، زاراوەی (مـیـرمیـرێن) بۆ شـانۆگـەری بەکارهاتووە.[٨]

٤ـ چایخانەکان:

چایخـانە و قـاوەخـانە و دیوەخـانەکـان لە هەمـوو شـار و شارۆچکەیەکی کوردستاندا جێگەی گێڕانەوەی حەکایەت و نواندنی جۆراوجۆر بوونە. سەکۆ و ژوورەوەی ئەو چایخانانە، کە شـەوان، هەقایەتی کوردەوارییان تێدا دەگێڕایەوە، هەر یەکەیان شانۆیەک بوون بۆ خۆیان.[٩]

٥ـ شێوە نواندنە میللییەکانی دیکە

ئاهەنگە شانۆییەکانی نەورۆز و مەدرەسەی مزگەوت و خان و سـەیرانگا، زبارە، گـەمـەی پاشـا هەڵبـژاردن، چوونە سـەیران، دیدەوانی.. بە چەند سـەرچاوەیەکی گـرنگی دیکەی بزووتنەوەی شـانۆیی میللیمـان لە قـەڵەم دەدرێن. خۆکردنە پاشا و نواندنی پاشایەتی لە زۆربەی شـارە کوردییـەکانی کۆتایی سەدەی ١٩، تا هاتنی ئینگلیزەکانیش لە کوردستاندا باوە بووە ( پێنج رۆژ بەر لە نەورۆز تا رۆژی سێزدەی نەورۆز). ئینگلتۆن لە کتێبەکەی خۆیدا لەبارەی کۆماری مهاباد، کە بە زمانی ئینگلیزی نووسیویەتی،

باسی دەکا. میهرەجانەکانی سلێمانێش، کە لە ١٩١٠ و ١٩١٢دا پەیدا بوونە، چەندین چالاکیی شانۆیی و نواندنی میللی و نەریتییان پێشکەش کردووە.[١٠] هەروەها، شانۆی میللیی قوتابخانە ئاینییەکانی کوردستان، ئاهەنگی مەدارس و چوونە سەیران، دیدەوانی. هەموو ئەمانە، سەرچاوەکانی شانۆی کوردن.[١١]

هەموو ئەمانە و دەیانی دیکەی هاوجۆری ئەمانە، بەدرێژایی مێژوو، لە سەدەکانی رابردوودا، لای کورد، دەکرێ بە شێوە نواندنێکی میللی بژمێردرێن. شانۆ لە کوردستاندا، بەم شێوەیە بووە و لەناو ئەم چالاکییانەدا دەرکەوتووە.[١٢]

لێرەوە، دەتوانین تێبینی دوو راستی بکەین:

١- پیشاندانی شانۆیی، لای ئێمە، پێش نووسینی شانۆنامە و بڵاوکردنەوەی تێکستی شانۆیی کەوتووە. چونکە، جگە لە هەموو ئەو شانۆ میللییانەش کە نەنووسراونەتەوە؛ لە ساڵی ١٩٠٥ دا، بە گەواهیی مامۆستا محەمەد تەیموور، شانۆگەرییەکی شێوە رۆژئاوایی، بە ناونیشانی "میری دیل" لە هەولێر پێشکەش کراوە.[١٣] هەروەها لە ساڵانی ١٩١٠ ـ ١٩١٢دا لە میهرەجانەکانی شاری سلێمانی دا نواندنی شانۆییان پێشکەش کردووە، بێ ئەوەی دەقە شانۆییەکانیان بڵاوبکرێنەوە.

٢- شانۆ، تا سەرەتای سەدەی بیستەم، لە کوردستاندا، بەو شێوەیەی یۆنانی دێرین (گریک) یان بە شێوەی ئەورووپا نەبووە،

بەڵکو لەناو چەند تەدارەک و نەریتێکدا خۆی بەرجەستە کردووە، چەند پێوەرێکی سەربەخۆی جیاوازی میللیی هەبووە؛ نەیتوانیوە وەک ژانرێکی هونەری - ئەدەبیی سەربەخۆ خۆی پێکبهێنێ.

لەوە دەچێ، بارودۆخی شارستانی و ئایدیۆلۆژیی کوردستان، تا سەرەتای سەدەی بیستەم، بەو شێوەیە نەبووبێ کە شانۆنامەی تێدا سەرهەڵبدات؛ چونکە، وەک رەخنەگری فەرەنسی، تۆدۆرۆف، باسی دەکات: ژانرێکی ئەدەبی بۆئەوەی سەرهەڵبدات، پێویستە کۆمەڵگەکەی، گەیشتبێتە ئاستێکی دیاری پێشکەوتن. ئەمەش چونکە، بە بۆچوونی تۆدۆرۆف: ژانری تازەی هەر سەردەمێک سیستەمێکی تایبەتی خۆی هەیە کە لەگەڵ ئایدیۆلۆژیەتی باوی ئەو سەردەمەدا یەک دەگرێتەوە.(١٤)

لێرەوە، دەکرێ بگوترێ: شانۆ، بەو چەمکە ئەوروپاییەی کە ئەمرۆ لە کوردستاندا هەیە، ژانرێکی تازەیە و لەرێگەی شەپۆلی ئەدەبیاتی تورکی و ئەورووپییەوە هاتۆتە ناو ئێمە.

کەواتە، هەر بۆیە، ناکرێت ئەو پۆلێن کردنەی بۆ مێژووی درامای ئەورووپی کراوە، بە هەمان شێوە، بەسەر شانۆی کوردیدا بچەسپێت. ئێمە پێویستە لە نووسینەوەی مێژووی شانۆی کوردیدا، مێتۆدێکی تۆژینەوەی تایبەت بەکاربێنین کە لەگەڵ هەڵکەوتی خۆمان بگونجێت. ئێمەی کورد، ناتوانین ناو لە هیچ قۆناغێکی شانۆیی خۆمان بنێین قۆناغی «کلاسیزم» یان «رۆمانسیزم» یان «مۆدێرن». چونکە، بۆ نموونە، لەوکاتەی رێبازی کلاسیزم لە

ئەورووپادا باو بووە، ئێمە لە کوردستان، بێ ئاگا و دوور لە ئەوان، خەریکی قەرەگۆز و کۆتەڵ و رووبەندبازی و میرمیرێن بووینە. کاتێ ئەورووپا رووی کردۆتە شانۆی رۆمانسیزم، ئێمە لە کوردستان، هێشتا هەر پابەندی ئەو هونەرانەی پێشوو بووینە. لە کۆتایی سەدەی نۆزدەم و دەیەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا، کاتێ ئەورووپا روودەکاتە سمبوولیزم و ریالیزم، ئێمە لە کوردستان، تازە بە تازە، دڵ و دیدەمان بە قۆشمە و عەرووسەک و گۆڵمەزەکانی فەرەج کوردی و ئەحەی ناسر و حافزی لەقلەقزادە و ئەحەی کرنوو زاخاو دەدەین. کاتێکیش، ئەورووپا لە ماوەی چارەگی یەکەمی سەدەی بیستەمدا خۆی تازە دەکاتەوە و روو لە شانۆی مۆدێرن و سوریالیزم و دادایزم و فوتووریزم دەکات؛ ئێمە لە کوردستان، هێشتا جارێ، نەک هیچ ئەکادیمیایەکی شانۆمان نیە و نەخوێندووە، بەڵکو تەنانەت هیچ تیپێکی شانۆییشمان دانەمەزراندووە: پشتمان بە تیپە شانۆییەکانی قوتابخانەکان بەستووە؛ ژمارەی شانۆگەرییەکانیشمان لە ژمارەی پەنجەکانی دەست تێپەڕ ناکەن.

لەسەر بنچینەی ئەم ڕاستییانەوە، ناچارین، بۆ نووسینەوەی مێژووی سەرهەڵدانی شانۆی کوردی، سێ قۆناغی بنجی دەسنیشان بکەین:

قۆناغی یەکەم: قۆناغی شانۆ میللییەکانمان (کۆمەڵێک تەدارەک و نەریت و نواندنی میللیی خۆمان) لە سەدەکانی دێرینەوە درێژ دەبێتەوە تا دەگاتە سەرەتای سەدەی بیستەمیش.

قـۆناغی دووەم: لە بڵاوبوونەوەی یەکـەم تێکسـتی شـانۆیی نووسـراوەوە دەست پێدەکـات، لە سـاڵی١٩١٩، لە ئەسـتـەمبـۆڵ، لەلایەن عـەبدولرەحـیم رەحـمی هەکـاری یەوە تا دەگـاتە سـاڵی ١٩٥٧.

قۆناغی سێیەم: لە ساڵی ١٩٥٧ بەملاوە دەست پێدکات کە بەرەو وەرچەرخانە مێژووییەکەی ساڵی ١٩٥٨ دەچین.

ژانری شانۆ، بە واتا ئەورووپییەکەی، تەنیا بۆ کورد تازە نیە: بۆ نموونە، شانۆی عـەرەبی لە عـیراقدا لەوەی خۆمـان کـۆنتر نیـە؛ کۆنترین شانۆگەری لە عیراقدا بریتیە لە " الشماس" نووسراوی حنا حـبش، کـە لە ١٨٨٠دا لە مـووسڵ پێـشکەش کـراوە.[١٥] لە تورکـیـاشـدا، ئیـبـراهیم شـیناسی ١٨٢٦ ــ ١٨٧١، لە سـاڵی ١٨٥٨دا بوو کـە یەکـەمین شـانۆنامـەی شـێـوە رۆژئاوایی، بە ناونیـشـانی شاعـیر ئێـڤلەمـەسی (زەماوەندی شاعـیر) بە زمـانی تورکی نووسی.[١٦] لە ئێـرانیش، دەگـەڕێتـەوە بۆ رۆڵی ئەو شانۆنامە ئەورووپی، بەتایبـەتی فەرەنسـیـیانەی، کە لە سەردەمی دامەزراندنی دارالفنون دا تەرجەمەی سەر فارسی دەکران و پیشـان دەدران؛ پاشـانیش کاتێ دەرهێنەر و دیکۆرسـاز و ئەکتـەری کـورد، مـیـر سـیـف الدین کـرمـانشـاهی لە سـاڵی ١٨٣٠دا لە تفلیـسی قەفقازەوە بۆ کرماشان دەگەڕێتەوە و لە تاران و تەورێز و کرماشان شـانۆ بە شـێـوەی ئەورووپایی دەست پێدەکـات. ئەم هونەرمـەندە کـوردە، رەنگە لە ئێـراندا یەکـەمین کـەس بێت کـە دەرهێنان و

بەکارهێنانی دیکۆری لە شانۆدا کردبێتە باو.[17] دووای ئەویش، رۆڵی فــتح علی اخــوند زادە ( ١٨١٢- ١٨٧٥) لە ســاڵانی ١٨٥٠-١٨٥٦دا - کــە مــیــرزا جــەعــفــەری قــەراجــەداغی شانۆنامەکانی ئەوی لە ئازەربایجانییەوە دەکردنە فارسی.[18]

لەوانەیە، گەلێک شانۆنامەنووس و دیکۆرسازی کوردی وەک میر سیف الدینی کرمانشاهی هەبووبن کە بە زمانی فارسی یان تورکی و عەرەبی خزمەتی شانۆی فارس و تورک و عەرەبیان کردبێت.[19] بەڵام بە زمانی کوردی؛ پێویستە چاوەڕێی ساڵی ١٩١٩ بکەین بۆئەوەی یەکەم تێکستی شانۆیی بە زمانی کوردی بڵاوبکرێتەوە. ئەمەش لە ئەستەمبۆڵ، بە ناونیشانی ( مەمێ ئالان) لە ژمارە ١٥ و ١٦ی گۆڤاری (ژین)دا بە پێنووسی عەبدولرەحیم رەحمی هەکاری. تێکستی ناوبراو بە سەرەتای بڵاوبوونەوەی ژانری شانۆنامە لە ئەدەبیاتی کوردیدا دەژمێردرێت، رێگە خۆشدەکات بۆئەوەی پەیتا پەیتا تێکستی شانۆیی دیکە بنووسرێن و بڵاوببنەوە؛ لەکۆتاییشدا جموجۆڵێکی شانۆی رۆژئاوایی لە کوردستانی عیراقدا دروست ببێت.

## شانۆنامەکەی ع. ڕەحمی هەکاری و شانۆی شێوە رۆژئاوایی
## لە کام دەفری شارستانیدا سەری هەڵدا؟

فاکتەرەکانی سەرهەڵدانی شانۆنامە لە ئەدەبیاتی کوردیدا ئەمانە بوون:

١ـ بڵاچەدانی هەستی ناسیونالیستی و راپەڕینە نیشتیمانییەکان، لە کۆتایی سەدەی ١٩م و سەرەتای سەدەی بیستەمدا؛ هەروەها دروستبوونی دەیان ڕێکخراوی سیاسی و کۆمەڵەی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی لە دەرەوەی کوردستان و لە ناوەوەدا؛ لە ئاکامی ئەمەشدا، دامەزراندنی یەکەمین قوتابخانە کوردییەکان و بەرزبوونەوەی ئاستی تەکنەلۆژی و ڕۆشنبیری و خوێندەواری لەناو گەلدا.[٢٠]

لە ١٩١٤ بەملاوە، زۆربەی قوتابیانی کوردی هەولێری، بۆ نموونە، دەرچووانی قوتابخانەی روشدیە یا مەدارس، دەچوونە (دارالمعلمین ابتیدائی سی) و (حقووق کولیەسی) لە مووسل. لە سلێمانی و شارە گەورەکانی دیکەی کوردستانیش، بە هەمان شێوە: بۆ فێربوون و خوێندن ڕوویان دەکردە بەغدا و ئەستەمبۆڵ. هەروەها، دووای کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمی جیهانی، یەکەمین قوتابخانەکان بۆ کوڕان لە کوردستاندا کرانەوە. دووا بەدووای ئەو، قوتابخانە بۆ کچانیش، بۆ یەکەمین جار لە مێژوودا دەرگاکانیان کەوتە سەر پشت.

ئەم قوتابخانە و کۆمەڵە و ڕێکخراوانە، ڕۆڵێکی دیاریان هەبوو بەسەر بووژاندنەوەی ڕۆشنبیری و نەشونمای جموجۆڵی شانۆیی. (لیژنەی فەن و تەمسیل)، بۆ نموونە، سەر بە قوتابخانەی

ئەربیل ئوولای هەولێــر، لە ســاڵی ١٩٢٠ دامــەزراوە و چەندین بەرهەمی هەبووە. جگە لەوەش تیپی شانۆیی قوتابخانەی زانستی کـە سـەر بە جـەمـعـیــەی زانســتی بوو لە سلێـمـانی، لە ١٩٢٦ دامەزراوە، چەندین بەرهەمی شانۆیی هەبووە. جگە لە پیشاندانی فـیلمی سـینەمـایی لەناو ئەم جـەمـعـیـەتەدا کـە کاریگەریی هەبووە بەســەر ســەرهەڵدانی هونەری شــانۆ تەنانەت چیــرۆکــیش لەو شارەدا.[٢١]

٢- برەوســەندنی جــمــوجــۆڵی تەرجــەمــە و رۆژنامــەگــەری: بڵاوکــردنەوەی چەند رۆژنامــە و گــۆڤــارێکی گــرنگی وەکــو ژین (ئەســتــەمــبــۆڵ ١٩١٨-١٩١٩)، (پێــشکەوتن)، (ژیان)، (ژیانەوە) لە کـوردسـتـانی عـیـراق لە سـاڵانی١٩٢٠دا. هەروەها بوونی ئینگلیزەکان لە کوردستـاندا، بەتایبەتی رۆڵی مـێجەرسۆن (حـاکـمی سلێـمـانی لە سـەرەتای سـاڵانی بیـسـتـدا)، لەرووی دامـەزراندنی یەکـەمین چاپخـانەکـان لە کـوردسـتـانی عـیـراقدا و بایەخدان بە تەکنیکە گێڕانەوەییە نوێکانی وەک سینەما و شانۆ، کـاریگەرییـان هەبووە بەسـەر سـەرهەڵدانی هونەری شـانۆ تەنانەت چیرۆکیش. ژمارە ٦٢ی رۆژنامەی ژیان لە ١٩٢٧دا ل ٣، ئاماژە بۆ کۆمپانیایەکی شانۆیی بیانی دەکات ـ لەوانەیە کۆمپانیایەکی ئینگلیزەکان بێت ـ کە لە سلێمانی نواندنی شانۆیی پێشکەش کردووە، دەڵێ:

تیاترۆ ! لەمەودووا تیاترۆیشمان ئەبێ! قۆمپانیایەکی قەومێک کە چەند رۆژێ لەمەوپێش هاتبوون و ئیشیان ئەکرد، تەشەبوسیان بە جەلب و هێنانی تاقمێکی تیاترۆ کرد. ئێستا تاقمی تیاترۆیان هێناوە و موساعەدەیان ئیستیحسال کردووە کە یاری بکەن. مەملەکەت لەم موئەسەسانە خالّی نابێ! و خەلّقی لەپاش ئیش و کار و مەتاعیبی یەومییە بۆ تەتبیعی دەماغ و ئیسراحەتی نەفس بەم تەحرە شتانە لزووم و ئیحتیاجییەک حیس ئەکا.

هەروەها لە سالآنی ١٩١٣ ـ ١٩١٥دا دوو جار سینەمای سەفەری لەلایەن تیپی عوسمانییەکانەوە لە رێگەی زاخۆوە هاتۆتە هەولێر: لەسەر گالیسکەیەک دانرابوو و فلیمی سولّتان عەبدولحەمیدی پیشانداوە، پاشان چۆتە کۆیە و سولێمانی.(٢٢)

رۆژنامەنووسی، لە ئەدەبی نوێی کوردیدا، بە منداڵدانی رەگەزە ئەدەبییە تازەکان و پەرەسەندنیان لە قەڵەم دەدرێ. بۆیەش دەبینین هەندێ لە یەکەم رۆژنامەنووسەکان (حسێن حوزنی موکریانی، پیرەمێرد، جەمیل سائیب، جەلادەت بەدرخان) بوونەتە یەکەم تازەکەرەوەکانی ئەدەب؛ رۆژنامە یان گۆڤارەکانیشیان فۆرمی تازە و ژانری نوێیان هێناوەتە ناو ئەدەبی کوردییەوە.

رۆژنامە و گۆڤارەکان تەنیا بیروڕای نەتەوەییان تێدا دەرنەدەبڕا، بەڵکو پشتیان بەستبوو بە سیستەمێکی ئێستاتیکی و نووسینی تازە؛ چەند فۆرم و ژانر و شێوازێکی تازەیان هێنایە ئارا بۆ دەربڕین. زۆر لە زاراوە زانستی و رەخنەیی و ئەدەبییە تازەکان

(بەتایبەتی ئەو وشانەی کە ئەورووپین و لە ئەدەبیاتی ئەورووپیدا بەکاردێن) لە ڕێی ڕۆژنامەنووسییەوە لەدایکبوون و بڵاوبوونەوە:
پیەس، تیاتر، ئوتوموبیل، شەمەندەفەر، هوتێل، پاسکیل ، بانق، تراژیدیا ، کۆمیدیا ، بۆمباباران، میکرۆب، شوفێر، بالوێزخانە.
ئەمە جگە لە دەوڵەمەندکردنی موفرەداتی زمان و پاککردنەوەی زمانی کوردیش لە وشەی بێگانە.(٢٣)

گرووپی نووسەرانی گۆڤاری ژین ( ١٩١٨ ـ ١٩١٩ )، ئەو گۆڤارەی کە عەبدولڕەحیم هەکاری کاری تێدا دەکرد، بۆ نموونە، پشتیان بەستبوو بە فەلسەفە و ئایدیۆلۆژیەتێکی هاوچارخ و سیستەمێکی تازەی بیرکردنەوە و نووسین. دروشمیان لەم دێڕەدا وەدیار دەکەوێ کە لە وتاری " بیر حەسبحال " بە زمانی تورکی لە ژمارە (١)دا لە ١٩١٨/١١/٧ دا نووسیویانە :

" ئایدیۆلۆژیەتە کۆمەڵایەتی و سیاسیە کۆنەکان،

ئەمڕۆ، ڕوو لە هەرەسن.

ئێمە ئەمڕۆ بەشداری لە سازکردنی چەند ڕچە و پرینسیپێکی تازە دەکەین".(٢٤)

٣- دروستبوونی پەیوەندییەکی کولتووریی بەهێز، بۆ یەکەمین جار لە مێژووی کورددا، لەنێوان ئەدەبی کوردی و ئەدەبی ڕۆژئاوادا، واتە لەنێوان نووسەرانی کورد و نووسەرانی ئەورووپا.

لە کۆتایی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا،

بەشێکی زۆری نووسەر و روناکبیرانی کورد، لە هەر چوار پارچەی کوردستانەوە، روویان کردبووە ئەستەمبۆڵ.

ئەستەمبۆڵ، وەک قاهیرە، لەو سەردەمەدا، ببووە مەڵبەندێکی رۆشنگەری و تیشکهاوێژی ئەوتۆ، کە نووسەر و رۆشنبیرانی نەک تەنیا کورد، بەڵکو رۆشنبیر و نووسەرانی زۆربەی میللەتانی وەک عەرەب و تورک و ئەرمەن و بولگاری و چەرکەس و فارس و هی دیکەشی تێدا کۆببۆوە؛ ئاڵوگۆڕێکی کولتووریی فراوانی تێدا ئەنجام دەدرا. ئەستەمبۆڵ، ئەم پایتەختە رەنگینە فرە کولتوورە، بەم شێوەیە، ببووە پردێک کە کولتووری هەموو ئەورووپای بە دنیای دوواکەوتووی میللەتانی رۆژهەڵات، لەوانە کوردیش، دەگەیاند.

لەسەر دەستی ئەو نووسەر و رووناکبیرانە کوردانەی ئەستەمبۆڵدا بوو، کە بیر و نووسین، بیری کوردپەروەی و ئەدەب، تێکەڵ بە یەکتر بوون؛ چەمکی تازە لەبارەی ژیان و ئەدەب و هونەر و شارستانیەت لەدایک بوون؛ کۆمەڵێک پێشبینی و تێگەیشتنی هاوچەرخ و بیروڕای تازە سەریان هەڵدا. ئەو رووناکبیر و نووسەرانە لە ١٩٢٣ بەملاوە، دووای قەدەغەکردنی زمان و کولتووری کوردی و راوەدوونانی رووناکبیرە کوردەکان لەلایەن رژێمی تورکیاوە، پەیتا پەیتا، گەڕانەوە بۆ کوردستان: حوسێن حوزنی موکریانی، پیرەمێرد، ئیسماعیل حەقی بابان، رەفیق حیلمی، ئەمین زەکی بەگ.. بۆ کوردستانی عیراق؛ هەروەها برایانی بەدرخان و عوسمان سەبری و قەدریجان و جگەرخوێن بۆ

کوردستانی سووریا. له کوردستاندا، بەتایبەتی له کوردستانی عیراقدا، مالّێکی کولتووریی هێنده رەسەن و بەبڕشتیان دروستکرد که تا ئەمڕۆش، ئێمه، له سای بەرهەم و سێبەری ئەواندا دەژین.

بەم شێوەیه ئەم نەوه نووسەره هاوچەرخه، که د. عەبدوڵا جەودەت، لەسەر وەزنی (تورکه گەنجەکان) ناوی دەنێ (کورده گەنجەکان)؛ بوونه پردێک لەنێوان ئەورووپا و کوردستان: کولتووری دنیای رۆژئاوایان ـ به تورکیاشەوه ـ بۆ یەکەمین جار له مێژوودا گەیانده کوردستان.(٢٥)

گرووپی نووسەرانی گۆڤاری ژین (١٩١٨ ـ ١٩١٩)، بۆ نموونه، که لەژێر کاریگەرێتیی کولتووری ئەورووپی و تورکه گەنجەکاندا پشتیان به ئێستەتیکایەکی هاوچەرخ بەستبوو؛ بۆ یەکەمین جار باس له ئازادکردنی ئافرەت و مافەکانی ئافرەتی کورد دەکات. هەر ژمارەیەکی ئەو گۆڤاره، نزیکەی ٧ لاپەڕەی تەرخانکرابوو بۆ بلاوکردنەوەی داهێنانی ئەدەبی و ژانره تازەکان: چیرۆک، وتار، شانۆنامه، بەتایبەتیش شیعری نوێ که مستەفا شەوقی و عەبدولرەحیم رەحمی هەکاری سەرتۆپی بوون. تەسیراتی ئەو نووسەرانەی گرووپی ژین زۆر زوو بەسەر کوردستانی عیراقدا رەنگ دەداتەوه، بەتایبەت بەسەر نووسەرانی (تێگەیشتنی راستی) و (پێشکەوتن) و (ژیانەوه) و (ژیان). لەوانەیه هەر بۆیەش ئەدەبی کوردی له عیراقدا له ١٩٢٠ بەملاوه تەکانێکی بەهێز دەدات.(٢٦)

دروستبوونی ئەو پەیوەندییە کولتوورییە بەهێزە، بۆ یەکەمین جار لە مێژووی کورددا، لەنێوان ئەدەبی کوردی و ئەدەبی رۆژئاوادا، واتە لەنێوان نووسەرانی کورد و نووسەرانی ئەورووپا، بە نوقتەگۆڕان و وەرچەرخانێکی کولتووری دەژمێردرێت. ئەم وەرچەرخانە کولتوورییەش، بەشێوەیەکی لەسەرخۆ و پەیتا پەیتا، لە ماوەی کۆتایی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای بیستەمدا، لە سێ رێگەوە گەیشتۆتە ئێمە:

**یەکەم:** راستەوخۆ لەرێگەی کولتووری ئەورووپا و زمانە ئەورووپییەکانەوە.

ئەمەش لەبەرئەوەی گەلێک لەو رووناکبیرانە لە زانکۆی پایتەختەکانی ئەورووپا ژیابوون؛ خوێندبوویان و بڕوانامەی بەرزیان هێنابۆوە، یان بەلای کەمییەوە فێری زمانەکانی فەرەنسی و ئەڵمانی و رووسی و ئینگلیزی و یۆنانی ببوون: ئەو ئەدەبیات و زمانە رۆژئاواییانەیان بەکاردەهێنا بۆ دەوڵەمەنکردن و تازەکردنەوەی ئەدەبیاتی کوردی. میقداد - مەدحەت، ژەنەراڵ شەریف پاشا، رەفیق حیلمی، حوسێن حوزنی موکریانی، دکتۆر عەبدوڵا جەودەت، ئیسماعیل شاوەیس، مەمدووح سەلیم(فەرەنسی)، عەبدولرەحمان بەدرخان و سورەییا بەدرخان (ئەرمەنی و ئینگلیزی و فەرەنسی)، ئەمین زەکی بەگ، تۆفیق وەهبی، عەبدوڵا گۆران (ئینگلیزی)، کامەران عالی بەدرخان و نوورەدین زازا (ئەڵمانی و ئینگلیزی و فەرەنسی)، جەلادەت

بەدرخـان (رووسی  و یۆنانی)، عـەبدولرەحـیم رەحـمی هەکـاری (رووسی و ئەڵمانی) فێر ببوون. ئەمە جگە لە زانینی تورکی یان عـەرەبی و فارسی. وەک دەشزانین، ئەم نووسەرانە، هەمـوویان، هەر یەکــە و لە بـواری خــۆیدا، ســوودیان لە کــولتــوور و زمــانە ئەورووپاییەکان وەرگرتووە؛ لە سەرجەم چالاکی و بەرهەمەکانیاندا رەنگی داوەتەوە؛ تەنانەت هەندێکیـان تەرجەمـەشیـان لەو زمـانە ئەورووپییانەوە کردووە.

**دووەم:** لەڕێگەی ئەو ئەدەبیـاتە ئەورووپییـەوە کـە تەرجـەمـە کرابووە سەر زمانی تورکی و لەلایەن نووسەرانی وەک پیرەمێرد و شێخ نووری شێخ ساڵح و نەجدەت کەرکووکلی و خەلیل خەیالی و مستەفا شەوقی و عەبدولرەحیم رەحمی هەکاری و جەمیل سائیب و ئەوانی ترەوە دەخوێنرایەوە.

لێرەدا پێـویستـە ئەوە بگوترێ کە تورکەکان پێش نەتەوەکانی دیکەی وەک عـەرەب و فـارس کـەوتبـوونە سـەر تەرجـەمـەکـردنی ئەدەبیــاتی ئەورووپایی بۆ ســەر زمــانی خــۆیان. کــوردیش ئەو ئەدەبیاتە ئەورووپاییەی، بە زمانی تورکی دەخوێندەوە. هەر بۆیەش دەبینین: کـورد لە سـەرەتادا، لەژێر کـاریگەرێتـیی تورکـدا دەبێت؛ پاشـان دەکـەوێتە ژێر کـاریگەرێتـیی عـەرەب لە عـیـراق، فـارس لە ئێراندا.

ئەو نووسـەرە کـوردانەمـان، ئەگـەرچی ئەورووپاشیـان نەدیبـوو،

بەڵام لەڕێگەی زمانی تورکییەوە توانیویانە پەی بە پێشکەوتن و تازەگەرییەکانی ئەدەبی ئەورووپی ببەن.(٢٧)

گۆران، بۆ نموونە، وەک د. عزالدین مستەفا رەسوول ئاماژەی بۆ دەکات، کاتێ باسی تازەکردنەوەی شیعری کوردی دەکات و باس لە تەئسیری شاعیرانی فەجری ئاتی ی تورک دەکات بەسەر شاعیرانی کوردەوە؛ ئەوەش دەسنیشان دەکات کە لەوکاتەدا شاعیرانی تورک، لە ئەنجامی باری تورکیا و بڵندبوونەوەی دەنگی ئازادیخوازیدا، بە رەنگدانەوەی شۆڕشی فەرەنسا و تەوژمی رۆمانتیکیی شیعری ئەورووپا، روویان کردبووە بیری تازە و، بۆ روخسار گەڕابوونەوە سەر کێشی شیعری فۆلکلۆری تورکی. هەر لەو کاتەدا شاعیرانی کورد لاسایی ئەوانیان دەکردەوە.(٢٨)

ئەم بۆچوونەی د. عزالدین جەختی لەسەر ئەو راستییە دەکاتەوە کە ئەدەبی تورکی خۆیشی - کە کاری کردۆتە سەر نووسەرانی کورد - لەژێر کاریگەرێتیی ئەورووپادا بووە، واتە نووسەرانی کورد لەڕێگەی زمانی تورکییەوە توانیویانە دەستی خۆیان بگەیەننە کولتووری ئەورووپی.

**سێیەم:** لەڕێگەی زمانی تورکی و ئەدەبیاتی نەتەوەیی نوێی تورکییەوە.

ئەدەبی تورکی لەو سەردەمەدا لەمێژ بوو، واتە پێش عەرەب و فارس، خۆی تازە کردبۆوە و کەوتبووە ژێر تەسیری پەرناس و

سمبوولیزمی ئەورووپی: سەروەتی فنوون (١٨٩٠)، فەجری ئاتی (١٩٠٨)، گەنج قەڵەملار (١٩١٠).[٢٩] کاریگەرێتیی ئەدەبیاتی تورکی بەسەر کوردانی ئەوکاتەوە، تەنیا لە بواری تێگەیشتن بۆ داهێنان، یان تەنیا لە ئاستی وەرگرتنی روانین و تەکنیک و بابەتەکاندا نەماوەتەوە، بەڵکو لەو سەردەمەدا زمانێکی تازەش هاتە ناوەوە، کە گۆران ناوی ناوە ( زمانی کوردیی عوسمانلی): ئەو زمانە تەواو لەژێر تەئسیری رۆمانتیکە تورکەکاندا بوو.[٣٠]

ئەو نووسەرە کوردانەی کە لەرێگەی زمانی تورکییەوە کەوتبوونە ژێر کاریگەرێتیی ئەدەبی نەتەوەیی تورکییەوە، دوو دەستەن:

دەستەی یەکەم: ئەوانەی دووربەدوور، هەر لە کوردستانەوە، ئەو ئەدەبیاتە تورکییە تازەگەرانەیان پێدەگەیشت، بێ ئەوەی ئەستەمبۆڵ و ناوەندە کولتوورییەکانی ئەستەمبۆڵیان دیبێت؛ تەنیا لەرێگەی خوێندنەوە و موتابەعەکردنەوە موتەئەسیر بوون. بۆ نموونە، بەڵگەنامە مێژووییەکان بۆمان دەسەلمێنن کە جەمیل سائیب بەردەوام بڵاوکراوە تازە تورکییەکانی ئەستەمبۆڵی، لەلایەن پیرەمێردەوە پێگەیشتووە و کەوتۆتە ژێر کاریگەرێتیی ئەو کولتوورە تورکییەوە. هەروەها شێخ نووری شێخ ساڵح نموونەیەکی دیکەی دیاری ئەم جۆرە نووسەرانەیە.[٣١]

دەستەی دووەم: ئەوانەی کە لە ئەستەمبۆڵ ژیابوون و راستەوخۆ لەناو ژینگە کولتوورییە تازەکەدا شێلەی ژیان و ئەزموون و

کولتوورەکەیان وەردەگرت؛ تەنانەت هەندێک لەو رووناکبیرانە، لە زانکۆکانی ئەنقەرە و ئەستەمبۆڵ خوێندبوویان و بڕوانامەی بەرزیان هێنابۆوە، یان بەلای کەمییەوە زۆر بەباشی فێری زمانی تورکی ببوون و بەکاریان دەهێنا بۆ دەوڵەمەنکردن و تازەکردنەوەی ئەدەبیاتی کوردی. عەبدولڕەحیم ڕەحمی هەکاری نموونەیەکی دیاری ئەم جۆرە نووسەرانەیە. هەروەها پیرەمێرد کە لە ماوەی سالآنی ١٨٩٧ ـ ١٩٢٣دا لە ئەستەمبۆڵ ـ راستەوخۆ لەناو جموجۆڵە ئەدەبییەکەدا ژیاوە ــ گەواهیمان بۆ دەدات و دەڵێ:

" ئێمە زۆرترمان لەوێوە، لە ئەستەمبۆڵەوە، پێگەیشتووین،. [٣٢]

کەواتە پیرەمێرد، ئەگەر وەک نموونەیەک بۆ نووسەرانی کوردی ئەستەمبۆڵ وەری بگرین، رادەی کاریگەرێتیی ئەو ئەدەبیاتە نەوژەنەمان بەسەر نووسەرانی کورددا بەم شێوەیە بۆ روون دەبێتەوە:

١ــ پیرەمێرد بە بەکارهێنانی وشەی (ئێمە) دان بەوەدا دەنێ کە نەوەیەکی نووسەرانی کورد، سەرتاپا، لە ئەستەمبۆڵدا پێگەییوە.. لەناو ئەمانەشدا بێگومان، ع. ڕ. هەکاری.

٢ــ پیرەمێرد، لەگەڵ نووسەر و شانۆنامەنووسانی گەورەی وەک رەجایی زادە ئەکرەم بەگ و عوشـشاقی زادە خالید زیا و حسێن رەحمی و رەزا تۆفیق، نەک هەر هاوڕێی نزیک، بەڵکو دراوسێش بووە و لە یەک ئاپارتماندا ژیاون. هەلبەتا دیارە ع.ڕ. هەکاریش دوور نەبووە لەم ناوەندە کولتوورییەی ئەستەمبۆڵ.

٣ـ پیرەمێرد، لەگەل نووسەرانی دیکەی وەک ع. ڕ. هەکاری، بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لەژێر کاریگەریتیی گۆڤاری سەروەتی فنوون دا بوونە و یەکسەر لەناو جموجۆڵە ئەدەبی و شانۆیی و هونەرییەکە ا ژیاون.

بۆیە دەبینین: ع. ڕ. هەکاری و پیرەمێرد پێش هەموو نووسەرێکی کوردی دیکە،دەست دەدەنە پێنووس و ڕەگەزی شانۆنامە (پیەس و تەمسیل، یان درام) بە خوێنەرانی کورد دەناسێنن و بایەخی شانۆنامە بۆ کوردان روون دەکەنەوە.(٣٣) پیرەمێرد، بۆیە، هەر خۆیشی، بۆ یەکەمین جار لە مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا، وتاری شانۆیی و ڕەخنەی شانۆیی دەنووسێت.(٣٤) لە هەمان کاتدا دەبینین: ع. ڕ. هەکاری و پیرەمێرد یەکێکن لە یەکەم ئەو نووسەرانەی کە شانۆنامەیان بە زمانی کوردی نووسیبێت.

لەو سەردەمەدا چەند گۆڤارێکی گرنگی نوێخواز لە تورکیادا بە زمانی عوسمانی بڵاودەکرانەوە. ئەو گۆڤارانە، کە لەلایەن نووسەرە کوردەکانی ئەوێ و ئێرە دەخوێنرانەوە، کاریگەریتێیەکی زۆریان هەبوو بەسەر ئەو نووسەرە کوردانە؛ لاساییان دەکردنەوە و شوێن پێی تورکەکانیان هەڵدەگرت.(٣٥)

گۆران، لەبارەی کاریگەرییتی ئەم قوتابخانە تورکییە بەسەر نووسەرانی کوردی ئەوکاتدا، گەواهیمان بۆ دەدات، دەڵێ:

نووسەر و شاعیرانی ئەوسا، بەتایبەتی شێخ نووری و ڕەشید نەجیب و من، هەموومان، بەیەکەوە، ئەمانڕوانیە یەک کلاوڕۆژنە.(٣٦)

گۆڤارەکانی شاعر (١٩١٨)، ئینجی (١٩١٩)، هەروەها لە بواری شانۆدا هەموویان گرنگتر: گۆڤاری شانۆیی (تماشا مصور تیاترو) کە لە هەمان کاتی گۆڤاری ژین دا دەردەچوو لە ئەستەمبۆڵ (١٩١٩)؛ تەرخانکرابوو بۆ بڵاوکردنەوەی تێکستی شانۆیی و لێکۆڵینەوەی شانۆیی.(٣٧)

هەموو ئەم گۆڤارانە، بەشێوەیەکی گشتی، بایەخێکی فراوانیان دەدایە بڵاوکردنەوەی شانۆنامە و لێکۆڵینەوەی شانۆیی و وتاری ڕەخنەگرانە لەبارەی دراما و قوتابخانە شانۆییەکانی ئەورووپا (٣٨)

بەم شێوەیە، نووسەرانی کورد، لەژێر کاریگەرێتیی ئەدەبیاتی هاوچەرخی ئەورووپی و تورکە گەنجەکاندا، بۆ نووسین و داهێنانەکانی خۆیان، پشتیان بە ئێستەتیکایەکی هاوچەرخ و پێوەرە ئەدەبییە تازەکان بەستبوو.

## کورتەیەک لەبارەی
## نووسینی شانۆنامە لای گەنجە تورکەکان
## ١٨٣٩ ـ ١٩٠٨

تورکەکان، سەبارەت بەوەی پایتەختی ئیمپراتۆریەتەکەیان لە ئەورووپا نزیک بوو و پەیوەندییەکی بازرگانی و سیاسی و ڕۆشنبیریی پتەویان لەگەڵ ئەورووپادا هەبوو، لە زۆر زووەوە (پێش

گەلانی کورد و عەرەب و فارس) توانیویانە پەیوەندی لەگەڵ ژیانی کولتووری و هونەریی ئەورووپا دروست بکەن. لە ماوەی ساڵانی ١٨٣٩ ـ ١٨٧٦دا، کە ئەم قۆناغە لە مێژووی دەوڵەتی عوسمانیدا بە قۆناغی تەنزیمات Tenzimat واتە حکوومەتی دەستووری ناسراوە؛ هەر چی بزووتنەوەیەکی ئایدیۆلۆژی و کولتووری و وێژەیی لە ئەورووپا دروست ببوایە، یەکسەر لە تورکیادا دەنگی دەدایەوە و بڵاو دەبۆوە.

بەم شێوەیە، یەکەم شانۆگەرییە شێوە رۆژئاواییەکان بە زمانی تورکی لە ساڵی ١٨٣٩ بەملاوە پیشانی خەڵک دران. شانۆگەرییە تراژیک و لیریک و کۆمێدییەکان، لەلایەن گرووپ و کۆمپانیا فەرەنسی و ئیتاڵییەکان یان لەلایەن باڵوێزخانەکانیانەوە، ئامادە دەکران و پیشانی جەماوەر دەدران.[٣٩] ئیتر، لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم بەملاوە، وردە وردە "تیاترۆ" بووە یەکێک لە هونەرە جەماوەری و بڵاوەکانی تورکیای عوسمانی. ئەم قۆناغەی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم، لە ژیانی کولتووریی تورکیادا، بە قۆناغی بووژانەوەی شانۆگەرییە شێوە رۆژئاواییەکان لە قەڵەم دەدرێ[٤٠] لەم قۆناغەدا چەند نووسەرێکی عوسمانی، کە ماوەیەکی زۆری ژیانیان لە ئەورووپا و بەتایبەتیش لە فەرەنسا بەسەر بردبوو، بە نووسین و بڵاوکردنەوەی شانۆنامەکانیان تەکانێکی گەورەیان دایە داهێنان و پەرەسەندنی نووسینی شانۆنامە لە ئەدەبی تورکیدا؛ لەوانە: ئیبراهیم شیناسی ١٨٢٦ ـ ١٨٧١، کە لە ساڵی

١٨٥٨دا یەکەمین شانۆنامەی شێوە رۆژئاوایی بە زمانی تورکی نووسی بە ناونیشانی شاعیر ئێڤلەمەسی (زەماوەندی شاعیر). ئیتر لەمە بەدووا چەندین نووسەری دیکەش پەیتا پەیتا شانۆنامەی کۆمیدی و تراژیک و لیریکیان بلاوکردەوە، گرنگترین ئەو شانۆنامەنووسە عوسمانیانەی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم ئەمانە بوون: نامیق کەمال ١٨٤٠ ـ ١٨٨٨، عەلی بەگ ١٨٤٤ ـ ١٨٩٩، ئەحمەد مەدحەت ئەفەندی ١٨٤٤ ـ ١٩١٢، شەمسەددین سامی ١٨٥٠ ـ ١٩٠٧، مەحموود ئەکرەم رەجایی زادە ١٨٤٧ ـ ١٩١٣، محەمەد رەفعەت ١٨٥١ ـ ١٩٠٧، ئەبو زیا تۆفیق ١٨٤٩ ـ ١٩١٣.

ئەم شانۆنامەنووسانە، لە رێگای داهێنانەوە، هەروەها لە رێگای وەرگێران و ئامادەکردنی شانۆنامەکانی مۆلییێر، راسین، ڤیکتۆر هووگۆ، ئەلکزەندەر دووماس.. هونەری شانۆگەری و دراماکیان، نەک هەر گەیاندە ئاستی نووسین و بلاوکردنەوە، بەڵکو گورێکی تازە و ناوەڕۆکێکی هونەری و بەرزیشیان بەخشییە جموجۆڵی شانۆگەری و نووسینی شانۆنامە بە زمانی تورکی.[٤١] لە هەمان کاتدا، چەندین گرووپ و تیپی شانۆیی عوسمانی لە تورکیا دامەزران کە گورێکی بەهێزیان بەخشییە ژیانی شانۆیی لە تورکیادا. ناودارترین ئەو گرووپ و تیپە شانۆییانە ئەمانە بوون:

١ـ تیپی تیاترۆی گەدیک پاشا لە ساڵی ١٨٦٠دا لەلایەن

کۆمپانیای سیرکی فەرەنسییەوە دامەزرا.

٢ـ کۆمپانیای شانۆی میناکیان لەلایەن هونەرمەندێکی ئەرمەنییەوە بە ناوی ماردیۆس میناکیان لە ساڵی ١٨٦٢دا دامەزرا، زیاتر لە ٢٠٠ شانۆگەریی تەرجەمەکراو و ئامادەکراوی بە زمانی ئەرمەنی پێشکەش کرد.

٣ـ گرووپی تیاترۆی تولوعەت لە ساڵی ١٨٧٨دا لە ئەستەمبۆڵ دامەزرا.

٤ـ گرووپی تیاترۆی شاری بورسە لەلایەن ئەحمەد وەفیق پاشاوە لە ساڵی ١٨٧٨دا دامەزرا، کە خاوەنەکەی پیاوێکی ئەرمەنی بوو ( تۆماس فەسوولفەجیان).

٥ـ تیپی شەرق تیاترۆسی لە ١٨٣٤.

٦ـ تیپی گولووگۆپ تیاترۆسی لە ١٨٨٥.

٧ـ تیپی عوسمانلی تیاترۆسی لە ١٨٦٢.[٤٢]

ئەم هەموو تیپە شانۆییە و چالاکییەکانیان، بێگومان، بێ کاریگەری نەبوونە بەسەر نووسەر و رۆشنبیرانی کوردی ئەستەمبۆڵ.

## لە ساڵی ١٩٠٨ بەملاوە

کاریگەرێتیی ئەدەبیاتی تورکی بەسەر ئەدەبیاتی کوردییەوە، بەشێوەیەکی پتەوتر، لەوانەیە لە ١٩٠٨ بەملاوە دەست پێ بکات. چونکە گەلی کورد، تەنیا لە ١٩٠٨ بەملاوە، واتە لەگەڵ هاتنە سەر حوکمی تورکە گەنجەکان و دامەزراندنی دەوڵەتی

دەستوورییەوە مافی بە کوردی نووسین و بڵاوکردنەوەی گۆڤار و ڕۆژنامەیان لە تورکیادا وەدەست هێنا.

ماوەی ساڵانی ١٩٠٨ ـ ١٩٢٣ بە قۆناغێکی تازە و گرنگ دەژمێردرێت لە بواری پەرەسەندنی ئەدەبیاتی کوردی و لە هەمان کاتدا بووژانەوەی ژیانی شانۆیی و هونەری لە تورکیادا. هەر لەگەڵ هاتنە سەر حوکمی تورکە گەنجەکان لە ١٩٠٨دا چەندین گرووپ و تیپی شانۆیی و کۆمەڵە و کۆمپانیای شانۆیی تازە لە شاری ئەستەمبۆڵدا دامەزران. گرنگترینیان ئەمانە بوون: دارولتەمسیلی عوسمانی، ئەستەمبۆڵ کۆمپانیاسی، ئەرتوگروول تیاترۆسی، عوسمانلی دۆتانمە جەمعیەتی، سحنەی هەوەس، میناکیان تیاترۆسی، عوسمان تانی تیاترۆسی، بینەمەجیان تیاترۆسی و عوسمانلی تیاترۆ کلۆبی. ئەم گرووپ و کۆمپانیا و کۆمەڵە و تیپە شانۆییە تازانە، بە گوڕێکی تازەوە دەستیان کردە دەرهێنان و خستنە سەر شانۆی شانۆنامە ئەوووپاییەکان. شانۆگەرییەکانی مۆلێیێر و راسین و ئەلکزەندەر دووماس و ڤیکتۆر هووگۆ سەرلەنوێ رەواجێکی فراوانیان پەیدا کردەوە.(٤٣) هەر لە ماوەی سەرەتای سەدەی بیستەمدا، بۆ یەکەم جار لە مێژووی ئەدەبیاتی تورکیدا، سەرتاسەری شاکارە شانۆییەکانی شکسپیر لەلایەن رووناکبیری کورد، د. عەبدوڵڵا جەودەت، تەرجەمە کرانە سەر سەر زمانی تورکی: چ بە شێوەی کتێب یان لە گۆڤارە عوسمانییەکاندا، بەتایبەتی گۆڤاری شهبال دا ( لە ژمارە ٧ تا ٢٥، لە ساڵی

١٩٠٩دا) بڵاوکرانەوە. هەروەها لە ماوەی ساڵانی ١٩١٣ ـ ١٩١٤ بۆ یەکەم جار لە مێژووی ژیانی هونەریی تورکیادا ئەکادیمیای هونەری شانۆ بە ناوی (دار البدائعی عوسمانی) لە ئەستەمبوڵ دەکرێتەوە و قوتابیان ( هەڵبەتا لەوانە خەڵکی کوردیش) بۆ خوێندنی پراتیک و تیۆری شانۆ رووی تێدەکەن. جگە لەمانەش، کۆمەڵێک نووسەر و شانۆنامەنووسی گەنج لەو ماوەیەدا دەرکەوتن و شانۆنامەکانی خۆیان لە شێوەی درامای ئەوووپییدا بە کتێب یان لە گۆڤارەکاندا چاپ و بڵاوکردنەوە. ناودارترین ئەو شانۆنامەنووسانە: سامی پاشازادە، عەبدولحەق حامید، جەلال ساهیر، خالید زیا عوششاقی زادە، جەناب شهابەددین، حوسێن سوعات، خالید فەخری ئووزانسۆی، یووسف ئورتاج.(٤٤)

شان بەشانی هەموو ئەمانەش، کۆمەڵێک گۆڤاری هونەری و ئەدەبی، کە لەژێر کاریگەریتیی قوتابخانەی ریالیستی و پەرناسی و سمبوولیزم و قوتابخانە هونەرییەکانی دیکەی ئەورووپادا بوون، دەرکەوتن و دەستیان کردە بڵاوکردنەوەی ئەدەبیاتی تازە لە فۆرم و تەکنیکی هاوچەرخانەی ئەورووپیدا. ئەو گۆڤارانە، بەشێکی فراوانی لاپەڕەکانیان تەرخانکردبوو بۆ بڵاوکردنەوەی تێکستی شانۆیی و لێکۆڵینەوەی شانۆیی. (٤٥)

بەم شێوەیە، شاری ئەستەمبوڵ لەو سەردەمەدا ١٩٠٨ ـ ١٩٢٣ جموجۆڵێکی شانۆیی گەورەی تێکەوتبوو: هەم لەڕووی تێکست و نووسینەوە، هەم لەڕووی خستنە سەر شانۆ و

دەرهێنانەوە. بێگومان، لەو سەردەمەشدا، وەک ئاماژەی بۆ کرا، ژمارەیەکی زۆر لە نووسەر و رووناکبیرانی کورد هاتبوونە ئەستەمبۆڵ، هەناسەیان لەم ئاووهەوا تازە و هونەرییە رەنگینە هەڵدەمشت: کەوتبوونە ژێر کاریگەریتیی رەوت و پێودانگە نەوژەنەکانی ئەم نووسەر و گۆڤار و گرووپ و رێبازە ئەدەبییە تورکی و ئەورووپاییانە؛ دەیانویست شوێن پێی ئەمان هەڵبگرن، تەکنیکی تازە و فۆرمی نوێ بۆ دەربڕینە ئەدەبییەکانی خۆیان بدۆزنەوە. کاریگەریتیی تازەبوونەوەی ئەدەبی تورکەکان بەسەر نووسەرە کوردە گەنجەکانەوە، لەو سەردەمەدا هێندە بەزەبر بووە، تەنانەت تا ساڵانی سییەکانیش هەر لەژێر کاریگەریتیی ئەو شەپۆڵە تورکی ـ ئەورووپاییەدا بوونە.

شایانی باسە، کە لە ئێرانیش، لە تاران، بە هەمان شێوە، یەکەمین گرووپە شانۆییەکان و یەکەمین گۆڤارە شانۆییەکان، لە دەوروبەری ساڵی ١٩٠٨ بەملاوە دەردەکەون: رۆژنامەی تیاتر لە ١٩٠٨دا. (٤٦) کۆمەڵەی نمایشی شرکت فرهنگی لە ١٩١٣، گرووپی تاتر ملی ١٩١٣، کۆمەڵەی ایران جوان ١٩٢٢، کۆمەڵەی کمدی ایران ١٩١٨، کە لەلایەن شانۆکارێکی کورد بە ناوی محموودی و چەندێکی دیکەی ئێرانییەوە دامەزرا و دە ساڵ بەردەوام بوو. (٤٧)

## یەکەمین شانۆنامەی شێوە رۆژئاوایی

## لەبارەی ژیانی کورد

لە گەرمەی ئەو جموجۆڵە شانۆییەی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا لە تورکیا، یەکێک لەو شانۆنامەنووسانە، مەدحەت ئەحمەد ئەفەندی ١٨٤٤ ـ ١٩١٢، شانۆنامەیەکی بە ناونیشانی کورد قزی (کچە کورد) لەبارەی ژیانی کوردەکانی کوردستانی تورکیا نووسیوە و لە دەوروبەری ساڵی ١٨٧٧دا لە شاری ئەستەمبۆڵ لەسەر شانۆ پیشانی خەڵک دراوە.(٤٨) ئایا دەکرێ ئەم شانۆنامەیە بە یەکەم شانۆگەریی کوردی لە قەڵەم بدرێ؟ ئێمە نازانین ئاخۆ ئەم شانۆگەرییە بە زمانی کوردی بووە یان تورکی؟ نازانین ئاخۆ نووسەرەکەی، کورد بووە یان تورک ؟ بەڵام سەرچاوەیەکی ئینگلیزی باسی ئەوە دەکا کە شانۆگەرییەکە چیرۆکێکی خۆشەویستیی کچە کوردێک دەگێڕێتەوە و باسی ژیانی کوردەوەرایی تورکیا دەکا، هەروەها کەسایەتییەکانیش بە جلوبەرگی کوردییەوە هاتوونەتە سەر شانۆ. لە هەمان ساڵدا، بەپێی هەمان سەرچاوە، شانۆگەرییەکی دیکەش، بە ناونیشانی (کاوەی ئاسنگەر) لە ئەستەمبۆڵ پیشاندراوە.(٤٩)

ئێمە لەبەر نەبوونی بەڵگەنامە و نەتوانینی سەلماندن، ناتوانین ئەم شانۆنامەیەی ئەحمەد مەدحەت ئەفەندی، بە یەکەمین شانۆنامەی نووسراوی کوردی لە قەڵەم بدەین. بە هەمان شێوە، لە ئێرانیش، چەندین شانۆنامە لەلایەن شانۆکارانی کوردی وەک

مەحموودی و سیف الدینی کرمانشاهی یەوە بە زمانی فارسی پیشاندراون و هەمان ئەو شانۆکارانە رۆڵیان هەبووە لە دامەزراندنی هەندێ گرووپی شانۆییدا.(٥٠) بەڵام مادام بە زمانی کوردی هیچیان نەکردووە، ئەستەمە بخرێنە چوارچێوەی شانۆی کوردییەوە.

هەر چۆنی بێ، بە درێژایی ئەو سەردەمە و تاکو ساڵی ١٩١٩، ئێمە هیچ تێکستێکی بڵاوکراوەی شانۆییمان بەشێوەیەکی بەرجەستە بە زمانی کوردی لەبەر دەستدا نیە، هەروەها هیچ بەڵگەیەکیشمان بەدەستەوە نیە کە لەو سەردەمەدا هیچ شانۆنامەیەکی نووسراو بە زمانی کوردی بڵاوکرابێتەوە یان پیشانی خەڵک درابێ. چونکە لەو سەردەمەدا، تەنانەت رووناکبیرە هەرە دڵسۆزەکانیش، بۆ نموونە نووسەرێکی وەک د. عەبدوڵا جەودەت، شانۆنامە ئەوروپاییەکانی، هەمیشە، تەرجەمەی سەر زمانی تورکی دەکرد نەک کوردی.(٥١)

## یەکەم شانۆنامە بە زمانی کوردی

لە مانگی نیسانی ساڵی ١٩١٩دا، لە ئەستەمبۆڵ، عەبدولرەحیم رەحمی هەکاری(١٨٩٠- ١٩٥٨) یەکەم شانۆنامە بە زمانی کوردی، بە ناونیشانی (مەمی ئالان) لە گۆڤاری (ژین) بە زنجیرە، لە ژمارە ١٥ و ١٦دا، بڵاودەکاتەوە.(٥٢)

گۆڤاری (ژین)، ژمارەی یەکەمی، لە ۱۹۱۸/۱۱/۷دا، دووا ژمارەشی، کە ژمارە (۲۵) بووە، لە ۱۹۱۹/۱۰/۲دا، لە ئەستەمبۆڵ بڵاوکراوەتەوە. بەرپرسی یەکەمی گۆڤارەکە، هەمزە بەگ موکسی بووە. محەممەد ئەمین بۆزئارسلان، سەرجەم ژمارەکانی ئەم گۆڤارەی کۆکردۆتەوە و لە چوار بەرگدا، سەرلەنوێ، لە شاری ئووپسالا لە سوێد، لە ساڵی ۱۹٦٥، لە وەشانخانەی ( دەنگ) چاپ و بڵاوی کردۆتەوە. ئێمە لێرەدا، لە ڕێنووسە کۆنەکەی خۆیەوە، بە پشت بەستن بە کوردییە لاتینییەکەی بۆزئارسلان، خستوومانەتە سەر ڕێنووسی ئەمڕۆ.(٥٣)

ئێوە و دەقی یەکەمین شانۆنامە بە زمانی کوردی:

# پیەسا کوردی

# مەمێ ئالان

تیاترۆیا کوردان فەزیلەتێ کوردان نۆشی ددت

دو پەردە پیەس

ئەسەرا: عەبدلرەحیم رەحمی هەکاری

ئەشخاص:

مەمێ ئالان

لەوەند-هەڤالێ مەمۆ، خولامێ میر

دایکا مەمۆ- چاڤرەش

ژنا مەمۆ- غەزال

پەردە ڤەبوو

(ئۆدەکێ کورمانجی خەملاندی، ب بەڕ و مافۆران راخستی. دیوارێ وێ، چەکێت مەمۆ پێ ڤە هلاویستی نە. چار تەرەفێ دیوار دۆشەک، بالگی نە.)

**مەجلسا ئەول**

**مەمۆ**

(تەنێ) بەلێ... ئیرۆکە میر ئەمر کری یە، غەزایە. نەیاران

سەرحەد گرتنە. زاریێ کوردان، مەعازەللاه وێ دبەر دەست وپییێن دوژمنان بچت.

ئەز ژ کی کێمترم! ما ئەز کورمانج نینم ! ما ناموسا هەر کوردەکی ناموسا من نینە! ئەلبەت.. ئەلبەت ئەزێ بچم. قیامەت رابت دیسا ئەز دچم. خوین سەران ببت دیسا ئەز خوە ناگرم. هەتا غەزال ژی من مەنعی بکەت، دیسا ئەز ناوەستم. ئەز مەمێ ئالانم. میرێ هەکاریا ئەمر کری یە. هەم سولتان سەلاحەدین شیرێ خوە کێشایە، ل پێشیا تەمامێ دنیایێ وەستانە، قودسا شەریف موحافەزە دکەت. ئوموومێ فەلان بەرهەڤ بوونە کو ئەوێ ژ ئیسلامێ بستینن. جوهاب ژ میرێ هەکاریان هاتیە، ئەم دێ بچنە هاریکاریا وی. ئیسلام هەمی، ل وێ بەرهەڤ بوونە. ژبۆ چ؟ ئەلبەت ژبۆ غەزایێ. ما ئەز ژ وان نازدارترم! ما خێرا غەزایێ دێ هەر ژبۆ وان بت!

(دایکا مەمۆ ژ دەردا تێت. وەکی کورێ خوە وەها پر غەلەیان دیت)

**چاڤرەش:** کورێ من، خودێ خێر کەت! تە چ بهیستی یە تو وەها حیددەتی، چاڤێ تە وەها سۆر بوونە؟

**مەمۆ:** دایێ، شیرێ خوە ل من حەلال بکە! دژمنان سەر ل مە راکری یە. هاتنە قودسێ ژ ئیسلامێ بستینن. ئو میر ئەمر کری یە، غەزایە، دێ بچنە غەزایێ. مادەم ئەز ژی کوردم ئۆ ئەز ژ ئالانم، باب و باپیرێت من دڤێ رێ دا چوونە، دڤێت ئەز ژی دڤێ رێ دا

بچم. تە شیرێ سپی دایە من. شیرێ خوە ل من حەلال بکە.

چاڤرەش: کورێ من، د رێیا دینێ خوە و د رێیا وەلاتێ خوە دا ئەگەر ئەز حەلال نەکەم، خوەدێ ژی من حەلال ناکەت. ئەگەر تۆ ئیرۆ نەچی، سبێ دژمن وێ بێتن. من تو ژبۆ رۆژەکی وەها خودان کری. کو تو وی جییێ ژبۆ دین و وەلاتێ خوە بگری، ناڤێ کوردیتییێ، کورمانجیتییێ ئیلا بکی، من شیرێ خوە حەلال کر، خوە دێ دگەل تە بی.

## مەجلسا دوییێ

(دەنگێ دەری تێت)

**مەمۆ**: دایێ، وێ دەری دقوتن( هەمان دبەزت).

ئەوکی یە؟ ئۆ ۆ ۆ.. برایێ لەوەند، کەرەم کە..کەرەم کە.

(لەوەند ژ دەر دا تێت)

**لەوەند**: ئەسەلامو عەلەیکوم ! (دچیت ملێ چاڤرەشێ).

**چاڤرەش**: عەلەیکوموسەلام، کەرەم کە، روونێ خوارێ( لەوەند رودنت). سەر سەرێ من هاتی، سەرچاڤان. تو قەنجکی،خوەشی؟ مال، بچووک؛ چاوانن؟

**لەوەند**: خوەدێ ژ تە رازی بت. مال، بچووک دەستێ تە رادمووسن.

**مەمۆ**: سەر سەرێ برایێ خوە هاتی.

**لەوەند**: سەرێ تە هەزار سالی بت. تە خوە بەرهەڤ کر، دادێ

دەستوورا تە دا؟

**مەمۆ**: مە ژی هەتا نوها ئەو خەبەر ددا. دایکا من شیرێ خوە ل من حەلال کر. دێ کارێ من بکەت. خوەدێ حەز کەت ئەم ژی کەنگێ بچن؟

**لەوەند**: ئیرۆکە مرۆڤەک ژ باشگالان هاتیە. گۆ «میر هەتا چۆلەمێرگێ چوویە» لازمە دڤێ هەفتی یێ دا ئەم بەرهەڤ بینە چۆلەمێرگێ.

**مەمۆ**: ئیرۆکە خوە بەرهەڤ بکن، سبێ زوو جا ئەم رێ بچن.

**لەوەند**: دەستوورا من بدە، ئەز ژی بچم خوە بەرهەڤ بکم.

**مەمۆ**: ل سەر سەرێ من هاتی.

( لەوەند دچت).

**چاڤرەش:** (خوە ب خوە) یا رەبی، ئەولادێ من ئەمانەتێ تەیە! تو فرسەت و سلامەتیێ بدی یێ! (تەماشا مەمۆ دکەت) کورێ من، خوەدێ دگەل تە بی! ئەز بچم، کارێ زەوادا تە بکم.

(چاڤرەش دچت).

**مەمۆ**: (خوە ب خوە) ئەی خالقێ من، تە چ لوتفەک مەزن راکرییە، دایەک خودان حەمیەت تە دایە من ! چ یا وجدانا من ئەمر دکەت، ئەو پێ رازی یە. چو جاران نابت مانعێ شولان. ئەز وێ دچم با غەزالێ. بووکا هەفتەیەکێ یە. ئەز بهێلم د جێ دا، ما ئینسافە؟!... بەلێ، ئینسافە، لەورا ئەڤینیا وەلاتی ژ هەمی ئەڤینیان مەسترە. ئەو ژی پێ رازی یە. ئەز بچم غازی ببم، جا ئەو

ژی ببته حەرەما غازییەکی. لازمە ئەو ژی فەخرێ بکەت.

(پیچەک مولاحەزە دکەت، وێ وەختێ غەزال ژ دەر دا تێت. د دەستەکی دا دەسمالە، چاڤێ خوە پاقژ دکەت. مەمۆ دەستی دگریت، روودنتە خوارێ).

**مەمۆ:** غەزال، تە خێرە؟ تو بۆ چ دگری ؟

**غەزال:** ما هون ناچن !

**مەمۆ:** بەلێ. ژ بەر چوونا من لازمە تو بگری ؟

غەزال: وەکی تو چوویی، پاش تە دێ چ بکم ! ما ممکنە ژینا من ! وەکی تو چوویی، روحێ من ژی دچت. من دگەل خوە ببە.

**مەمۆ:** د شەرێت وەها دا شەرمە ژن دگەل مە بێن. هەم ژی دایکا من تەنێ یە. تو دێ چاوا بهێلی!

**غەزال:** ئەز شەڤ- رۆژ خدامی ژ دایکا تەرا بکم، ئەز ژێ عاجز نابم، ئەز ژێ تێر نابم.

(رۆهنکان ئیزهار دکەت).

ئەز دێ چاوا تە بدم دەستێ فەلەکێ، دێ چاوا ژ تە دوور ببم !

مەمۆ( ب ئاهەنگ)

ئیرۆ هەفتە داوەت کری

غەزایێ ئەز ژ تە کری

ئەز دچمە بەر کافری

غەزالا من، دەلالا من، بەس بگری

**غەزال:** مەمۆ ئیرو بوو عەسکەرە

ئەڤینیا مە بوو کەسەرە
تو من ببە دگەل خوە، هەرە
یان بکوژە، یان بکوژ پاشێ هەرە

**مەمۆ**: تو بەس روهنکان ببارینە
ئیرۆ دژمن مە کینە
وەستانا من لائق نینە
غەزالا من، دەلالا من، بەس بگری

(غەزال نەهشیار دکەڤت).
پەردە دکەڤت

**پەردا دویێ**

(پەردە ڤەدبیت. دیسا رایخستنا بەرێ. غەزال ب تەنێ سەر دۆشەکێ روو نشتی یە، ملە حەزان دکەت و یەکجار)

غەزال: ئاه... یا رەبی، ئەڤە بوو سالەک، چو جەواب ژ مەمێ نەهات. جارەک دیتر من مەمێ دیتبا، بلا مەلەکێ مەوتێ هاتبا، ئەمانەتێ خوە ژ من گرتبا !

( رادبیت پیبیان)

ئاه... ئاه...ئەڤە چ ژینە ! ما مرۆڤ ژبۆ دەرد و ئەلەمان هاتنە دنیایێ !

**چاڤرەش**: (ژ دەر دا تێت) غەزال، خوەدێ خێر کەت، تە چ یە؟ دیسا تو وێ دگری یان ژبەر لاوێ من نەگری ! نەگری ! مزگینا من ل تە ئیروکە مرۆڤەک ژ ئۆردووگاهێ هاتیە، لەشکەرێ مە بەردایە دژمنان، دژمن تەسلیم بوونە، مەمێ سلامەتە ڤان رۆژان دێ بیت.

**غەزال**: «بێ خوە» خوەدێ گوهـ دەنگێ تە بی !

( خوە بەرهەڤ دکەت، گوتنا خوە پۆشمان بوو، پێش خەسییا خوە شەرم کر).

**چاڤرەش**: غەزال، خوەدێ وەکی مەمێ دا من، تو ژی ژبۆ مەمێ هاتی دنیایێ. شەرم نەکە. ئەز ئیفتیخارێ ب تە دکەم کو تو بووکا منی. مەمێ چەند لاوە، تو ژی هندە دەلالی. مەمێ چەند جامێر و خوەدان میرینی یە، تو ژی هندە خوەدان ئیسمەتی. ئەز ل پێش تە نابێژم، خوەدێ شاهدە، هەمی جهان ئەز دبێژم، چونکی راستییێ مرۆڤ ئینکار بکەت، بێ ئینسافی یە. خوەدێ وە هەردوکان بۆ من بهێلیت.

(دەنگێ دەری تێت، غەزال دچیت)

**غەزال**: ئەوکی یە؟

دەنگەک: ئەزم

( خولامەک ژ دەر دا تێت).

**خولام**: خالەتا چاڤرەش، خانما من گۆت بلا هەتا لێرە کەرەم بکەت.

**چاڤرەش**: (دبێژیتە غەزالێ) غەزال، ئەز وێ دچم، ئەمانەتێ تە ئەڤ دەر.

(چاڤرەش دچیت، غەزال تەنێ دمینت).

غەزال: ئاه ... ئاه ... خوەسییا من مزگینی دا من. عەجەبا راستە، جارەک دی ئەم دێ بگیهینە یەک؟

(دەنگێ دەری تێت، غەزال دبەزت).

**غەزال**: ئەو کی یە؟

**دەنگەک**: مێهڤانە.

(پۆشیا خوە ب دەڤێ خوە دگریت، دەری ڤەدکەن).

**غەزال**: کەرەم کە!

**مێهڤان**: (تەماشە دکەت، ناس ناکەت) سەلامون عەلەیکوم.

**غەزال**: عەلەیکومسسەلام. کەرەم کە، سەر سەرێ من هاتی.

**مێهڤان**: (روودنێت) خوەدێ ژ تە رازی بیت.

**غەزال**: (تاسەک دەو تینت، دەستێ خوە ددەتە سنگێ خوە) کەرەم کە.

**مێهڤان**: (وەردگریت، دەوی ڤەدخوت) من گەلەک ژتە منەتە.

(غەزال دچیت کارێ نانی بکەت).

**مێهڤان**: زەحمەتێ نەکێشە. ڤێ گاڤێ ئەز وەستامە، ئەز نەشێم چو بخوم.

**غەزال**: مێهڤان مێهڤانێت خوەدێ نە، چاوان ئەمر بکن ئەم مەجبوورن ئەمرێ وان بجھ بینن.

**مێڤان**: خوەدێ کێماسی نەکەت. پرسیار بێ عەیبن، ئەز دێ تشتەکی ژ تە پرس بکم.

**غەزال**: ئەمر کە.

**مێهڤان**: هون کەچا مالێ نە، یان بووکا مالێ نە؟

**غەزال**: هون مێڤان نەبان، مقابلێ ڤێ سوئالا تە، لازم تات ئەز ب چەکان جەواب بدەم. هندە قەدەر هەیە تو مێهڤانی، قەدرێ مێهڤانی یێ سەر مە واجبە و چوکوردان د مالا خوەدا دەنگ مێهڤانان نەکری یە و دائیما کورمانجان د رێیا مێڤانێ خوە دا جان دایە. دژمنێ کورمانجان ببتە مێهڤان، دیسا قەبوول دکن و قەدری دگرن وخزمەتێ بۆ دکن.

**مێهڤان**: غەزالا من! سەد ئافەرین بۆ ئیسمەتا تە! ئەز فەخرێ ب تە دکم! تە ئەز نەناسیم، ئەز مەمۆ مە! شیرێ تە خواری ل تە حەلال بیت. ( هەما رادبت، دەستێ غەزالێ دگرت).

**غەزال**: (یەکجار هەرەکەتا خوە تەبدیل کر، بێ ئێختیار) ئاھ... (هەر دو خوە ل ستوویێ یەک ددن، سەر دۆشەکێ دکەفن، نەهشیار دبن).

(چاڤرەش دەری دقوتت. کەس دەری ناڤەکەت. دەری دشکینت، ژ دەر تێت، بووکا خوە د وی حالی دا دبینت. تەماشە دکەت،

ناناست).

**چاڤرەش**: عەجایب، قەت ممکونە ئەڤ ژی دێ ببا! ناموسا کورێ من، ما ممکونە وەها د دەستێ نەیاران پامال ببت ! ئەڤ چ خائینی یە ! نەخێر ! (جارەک دی دچت تەماشە دکەت) لازمە ئەز ببرم، یان بکوژم ! قەت چو کورد ناموسا خوە وەها ببینت، ناوەستت ! بەلێ، ئەو ناموسا من !... و ئەمانەتێ منە !

( جارەک دی دچت تەماشە دکەت، تێتە غەلەیانێ).

چاڤرەش: بەلێ.. بەلێ.. کوشتن.. ژ غێرێ وێ چو دیتر نینە. خوەدێ ژی ژ من نا پرست. چونکی ل سەر ناموسێ یە.

(هەمان دبەزتە، رم ئانی، دئینت دانتە ل سەر سینگێ کورێ خوە)

**چاڤرەش**: هان بۆ تە! زەرپا ناموسێ، ئەی جاناوەرێ ناموسێ !

**مەمۆ**: ئاه... دادێ..

**غەزال**:( هەمان هشیار دبت، رمێ د سینگێ مەمۆ دبینت، دبێژتە خەسیا خوە) وای تە چاڤێ خوە کۆر کر( ل ناڤ سەرێ خوە ددت).

**غەزال وچاڤرەش:** ( هەردو دگەل یەک ب ئاهەنگ)

هەرێ مەمۆ، مەمێ ئەباسی، ئەباسی

بریندارۆ مەمۆ، دایێ کۆر بت، نەناسی!

نووسەری ئەم شانۆنامەیە، عبدالرحیم رەحمی هەکاری( ١٨٩٠-١٩٥٨)، وەک زنار صلۆپی ئاماژەی بۆ دەکات، ئەندامی چالاکی چەندین ڕێکخراوی کوردیش بووە، لەوانە: یەکەمین کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد کە بە ناوی (هێڤی) لە ئەستەمبۆڵ لە ٢٧/٧/١٩١٢ دامەزراوە، هەروەها ئەندامی دامەزرێنی کۆمەڵەی تەعالیی کورد بووە لە ١٩١٨ لە ئەستەمبۆڵ.(٥٤) ئەم پابەندبوونەی نووسەر بە ڕێکخراوێکی سیاسیی کوردییەوە نیشانەی هەستی

نیشتمانپەروەریی نووسەر دەگەیەنێت و بەلگەی ئەوەیە کە نووسەر خاوەن پرەنسیپێکی ناسیونالیستانە بووە.

هەکاری، لەگەڵ سەعید نەورەسی دا، پێکەوە، لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا، لە جەنگی تورکیای عوسمانیدا دژ بە رووسیای قەیسەری، شەڕ دەکەن. هەر پێکەوەش، دووای برینداربوون، بە دیل دەگیرێن و ساڵێک لە ئەسارەتدا لە نزیک چەمی ڤۆڵگا ژیان بەسەردەبەن. لەوانەشە ئەم دوورکەوتنەوە و ئەسیربوونە بووبێتە ئیلهامی شانۆنامەکەی.

لە ١٩٢٣دا، کاتێ زمان و کولتووری کورد لە تورکیا قەدەغە دەکرێت، هەکاری ناچار دەبێت پشت لە بیری ناسیونالیستی بکات و رووبکاتە ژیانی دیندارەتی و خزمەتی ئیسلام بکات.(٥٥)

نووسەر، لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا، بەشێوەیەکی راستەوخۆ لە ناوجەرگەی رووداوە رۆشنبیرییەکاندا و لەناو دڵی جموجۆڵە ئەدەبییەکانی وەک سەروەتی فنوون (١٨٩٠)، فەجری ئاتی (١٩٠٨)، گەنج قەڵەملار (١٩١٠) لە ئەستەمبوڵ، واتە لەناو کەشوهەوا نوێخوازییەکەی گەنجە تورکەکاندا ژیاوە؛ راستەوخۆ بەهرەی لە بەرهەمەکانی ئەوان و کولتووری ئەوروپایی وەرگرتووە. کەواتە، یەکێکە لە یەکەم ئەو نووسەرە هاوچەرخانەی کە پێوەندیی بە کولتووری رۆژئاواییەوە کردووە و بەشێوەیەکی راستەوخۆ سوودی لە جموجۆڵە فەرهەنگییە رۆژئاواییە نوێخوازەکان وەرگرتووە. دیسان، ناوبراو، یەکێکە لە یەکەمین نووسەرە کوردەکان

کە فێری زمانێکی ئەورووپایی (رووسی و ئەڵمانی) بووبێت و سوودی لێیان دیبێت.

لە ئەنجامی ژیان لە ئەستەمبوڵ و فێر بوونی رووسی و ئەڵمانی و وەرگرتنی ئەو کولتوورە رۆژئاواییە بەشێوەیەکی راستەوخۆ، ع.ر. هەکاری لە کولتووری ئیسلامییەوە باز دەداتە سەر کولتووری رۆژئاوایی و لە هەمان کاتدا پێکەوەیان گرێ دەدات و سوودیان لێ وەردەگرێت. ئەمەش بە ئاشکرا، لە شانۆنامەکەیدا و تا رادەیەک، بەسەر تەکنیک و فۆرمە شیعرییەکانیدا رەنگی داوەتەوە. بەم شێوەیە، ساغ دەبێتەوە کە سەرهەڵدانی یەکەمین شانۆنامەی کوردی، بەری داری ئەو روانینە نەوژەنەی ع.ر. هەکاری یە کە لە ماوەی ساڵانی ١٩٠٨-١٩١٩دا لەژێر کاریگەرێتیی جموجۆڵی شانۆی رۆژئاوایی و تورکەکاندا لەلای خەملێبوو.(٥٦)

دوو قۆناغی فیکریی دیار لە ژیانی ع. رەحمی هەکاری دا دەبینرێت:

١- خەباتی نەتەوەپەروەری و بیری ناسیونالیستانە، کە لە سەردەمی گەنجێتییەوەی دەست پێدەکات تا ساڵی قەدەغەکردنی زمان و کولتووری کوردی لە تورکیا، واتە تا ساڵە شوومەکەی پەیمانی لۆزان: ١٩٢٣.

٢- دیانەت و خەباتی ئیسلامەتی، کە لە ١٩٢٣ دەست پێدەکات و هەموو ژیانی داهاتووی خۆی بۆ تەرخان دەکات؛ زیاتر لە هەژدە کتێب بە زمانی تورکی لەم بارەیەوە بڵاودەکاتەوە. گەلێک

جـارانيش، بەتايبـەتى پێش سـاڵانى ١٩٢٠، ئەم دوو فـيكرەى لەيەكـتـر گـرێ دەدا، وەک لە شـانۆنامـەى (مـەمێ ئالان) دا دەبينين.[٥٧]

تا ئێستا بۆمان ساغ نەبۆتەوە ئايا ئەم شانۆنامەيە خراوەتە سەر شـانۆ يان نا؟ بەڵام، بە شـايەدى و ئاگـادارىى مـحـەممەد ئەمين بۆزئارسلان: ئەم شـانۆنامـەيە، دوواى بڵاوبوونەوەى لە گـۆڤـارى (ژين)، لە شێـوەى كـتـێـبێكى سـەربەخـۆدا لە ساڵى ١٩٢٠ لە ئەسـتـەمـبـوڵ چاپكراوە.[٥٨] بەمـەش، ئەم شـانۆنامـەيە دەبێـتـە يەكـەمين شـانۆنامـەى چاپكراوى كـوردى؛ ع. ر. هەكاريش دەبێتـە يەكەمين نووسەرى كورد كە شانۆنامەيەكى خۆى لەشێوەى كتێبدا چاپكردبێت.

گـومـان لەوەدا نيـە كـە تەنيـا بەكـارهێنانى زاراوەى (پيـەس) و (تياترۆ) لەسەر نێوچەوانى تێكستێكى كوردىى ساڵى ١٩١٩دا: داهێنانێكە؛ نيـشـانـەى ئەوەيە كـە نووسـەرەكـەى ويسـتوويەتى، بۆ يەكەمين جار لە مێژووى كورددا، ژانرێكى نوێ بهێنێتە ناو ئەدەبى نەتەوەييـمـانەوە. لەوەش زياتر، نووسـەر، بە هوشيـارييـەوە لەبارەى ئەم مەسەلەيە، ئاگاداربووە كە ئەم كارەى ئەو تازەيە؛ ويستوويەتى بەردێكى بناغـــە بۆ شـــانۆيەكى نەتەوەيى دابرێژێێت، دەڵێ: (تياترۆيا كـوردان فەزيلەتا كوردان نۆشى ددت). لەوانەيە، هەر لە سـۆنگەى ئەم مـەبەسـتـەش، لە گـۆشـەنيـگايەكى سـيـاسى - نەتەوەييـەوە بابەتى بەرهەمـەكەى خۆى پێشكەش كردووە؛ ئەگـينا

هەمان چیرۆکی شانۆنامەکە، وەک لای ئەلبێرت کامۆدا لە شانۆنامەی (سوء التفاهم) دەبینین، بە چەندین لای فەلسەفیی دیکەدا دەکەوێتەوە.

سەبارەت بەوەی کە نووسەر خوێندنی ئیلاهیاتی لە زانکۆی ئەنقەرە خوێندووە و رۆشنبیرییەکی ئیسلامیی قووڵی هەبووە و لەگەڵ زانای ناوداری ئیسلامەتی (سەعید نەورەسی) زۆر هاورێ بووە، هەروەها لەبەر ئەوەیش کە لەو سەردەمەدا خەتێکی بیرکردنەوەی پانی ئیسلامی سیاسیی بۆ رزگاربوون لەدەست نێڵی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و ئیتتیحادییەکان هەبووە؛ دەبینین نووسەر لەم شانۆنامەیەدا دووکێشەی سیاسی لەیەکتر گرێ داوە. یەکەم: جەنگی ئازادکردنی قودس لەدەست خاچپەرستەکان، بە سەرکردایەتیی سەلاحەددینی ئەییووبی لە سەدەی یازدەهەمدا. دووەم: جەنگی سەربەخۆیی کورد دژ بە دەوڵەتی عوسمانی و ئیتیحادییەکانی دووای ۱۹۰۸.

لە شانۆنامەکەدا، ناوی سوڵتان سەلاحەددینی ئەییووبی هاتووە، کە شیری لەڕووی خاچپەرستەکان هەڵکێشاوە و دەستی بە جەنگی رزگاریخوازی کردووە؛ میری هەکارییانیش، واتە میری کوردان، فەرمانی دەرکردووە کە بەتەنگ لەشکری ئازادیخوازی سوڵتان سەلاحەددینەوە بۆ ئازادکردنی قودس بچن. ئیدی، هەموو عێل و عەشیرەتی کوردان کۆبوونەتەوە و بەرەو «قودسی شەریف» بەرێ کەوتوون بۆئەوەی «وڵات» لەدەست «فەلان»رزگار بکەن.

لێرەدا، ناوەڕۆکی شانۆنامەکە دوو دیوی یەکانگیری دەبێت. دیوی یەکەمیان دەربڕینی بیرێکی دینی، کە پەسەندکردنی غەزای سەلاحەددین و جەنگی ئیسلامە بۆ ئازادکردنی قودس. دیوی دووەمیشیان، کە ڕێی تێدەچێت مەبەستە سەرەکییەکە بێت، بریتیە لە جەنگی سەربەخۆیی کوردان لەدەست ئیتتیحادییە تورکەکانی سالانی ١٩٠٨- ١٩٢٠، کە نووسەر لەبەر سانسۆر و لە ترسی ئیتتیحادییەکان تەنیا توانیویەتی بەم شێوە سمبوولییە دەری ببڕێت. هەر چۆنێک بێت، ئەم شانۆنامەیە، لە بواری ئایدیۆلۆژیدا، بە گەوێکی گرنگ دەژمێردرێت لەنێوان بیری کوردپەروەی و پان-ئیسلامیی کورد، کە هەر دووکیان، لە تورکیای عوسمانیی سالانی جەنگی یەکەمدا باو بوون.

نووسەر ناواخن و چارەنووسی جەنگەکەی هێندە بە لاوە گرنگ نیە، بەڵکو زیاتر وەک هۆکارێک بۆ دوورکەوتنەوەی پاڵەوانەکە بەکاری هێناوە. ئەوەی ناواخنی شانۆنامەکە دەوڵەمەند دەکات بریتیە لەو تراژیدیایەی کە لەپاش ڕۆشتنی مەمۆ دەقەومێ: کوژرانی مەمۆ بەدەست دایکی خۆی. هەر لێرەشدا، عەبدولرەحیم هەکاری لەگەڵ ئەلبێرت کامۆی فەرەنسی یەکتر دەگرنەوە.

هەر کە پەردە دەکرێتەوە، دەبینین: پاڵەوان لە هەڵوێستێکدایە: هەڵبژاردن. ئایا بچێتە جەنگەکە و کردەوەیەکی هەبێت، یان نەچێت؟ مەم تازەزاوایە، لە هەمان کاتدا تازە جەنگی سەربەخۆیی وڵات دەستی پێکردووە. ئایا ڕێگای کامەیان هەڵبژێرێت: چوونە

جەنگی سەربەخۆیی وڵات (کە ئیحتیمالی لەناوچوونی تێدایە) یان مانەوە لەگەڵ تازەبووکەکەی؟ سەرەتای شانۆنامەکە بەم دوودڵی و خۆدوواندنە، بەم هەڵوێستە چارەنووسسازە دەست پێدەکات. نووسەر لە سەرەتای شانۆنامەکەوە پاڵەوانی خستۆتە هەڵوێستی هەڵبژاردنەوە. ئەمەش تەکنیکێکی شانۆیی هاوچەرخ و زیرەکانەیە، لە تەکنیکی بەرهەمەکانی نووسەری ئەڵمانی زمان، فرانس کافکا دەچێت؛ رەگەزی تەشویقی تێدایە.

نووسەر درامای شانۆنامەکەی لەسەر چەند کەرەستەیەکی ریالیستانەی خۆماڵییەوە هەڵچنیوە. دراما لەم بەرهەمەدا چەند پەیوەندیی بە کێشەیەکی سیاسییەوە هەیە، هێندەش پەیوەندیی بە خاسیەتەکانی کۆمەڵی کوردەواری و دەروونی مرۆڤی کوردەوە هەیە. دوو دیوی یەکانگیری سیاسی - سایکلۆژی، نەتەوەیی - مرۆڤپەروەرانەی هەیە. بۆیە دەبێ ئاماژە بەوە بدەین کە نووسەر چەندین کێشەی سیاسی - ئەخلاقی- مرۆڤایەتیی لەیەکتر ئالاندووە و ورووژاندوونی. ئەم ئاڵۆزییەش، پەیوەندیی بە رۆحیات و خاسیەتەکانی کەسایەتیی کوردەوە هەیە کە مرۆڤێکە نیشتیمانەکەی داگیرکراوە و دەیەوێ ئازاد بژی، بۆ ئەم ئازادییەش پێویستیی بە خۆبەختکردن هەیە. بەرهەم و چارەنووسیش؛ بەداخەوە، نووسەری شانۆنامەکە پێمان دەڵێ: بێهوودەیە.

بەکارهێنانی چەند رەمز و نیشانە و نەریتێکی وەک: سەلاحەدینی ئەیبووبی، میواندۆستی، خۆشەویستی، مێرخاسی،

لەخۆبوردوویی لەپێناو نیشتیماندا، ئازادیخوازی، ئازایەتی، گوێڕایەڵبوون بۆ میر، پاراستنی ناموس.. کۆمەڵێک نیشانەن کە نەتەوەی کوردی پێ دەناسرێتەوە.(٥٩) نووسەر، ورد و زیرەکانە بەکاری بردوون کە لەگەڵ ڕووانینە ناسیونالیستییەکەی خۆی بۆ شانۆ یەک دەگرێتەوە.

لەم شانۆنامەیەدا، بۆ یەکەم جار لە نووسینی کوردیدا، چاومان بە چەندین زاراوەی هونەریی تایبەت بە شانۆ دەکەوێ: تیاتر، پیەس، ئەشخاص، مەجلیس. ئەمە ئەوە دەردەخات کە نووسەر باش شارەزای هونەرەکە بووە. بەم کارەیشی، زمانی کوردیی، بەتایبەتی زاراوە هونەرییەکانی، دەوڵەمەند کردووە. لە هەمان کاتدا ویستوویەتی، هەندێ جار، هەر دوو دیالێکتی ژووروو و خوارووو تێکەڵ بە یەکتر بکات و ڕێگە خۆش بکات زمانێکی ستاندارد دروست ببێت. لەڕووی ڕێنووسیشەوە، ئەم تێکستە، بەڵگەنامەیەکی بایەخدارە بۆ ئەوانەی لە مێژووی پەرەسەندنی ڕێنووسی کوردی دەکۆڵنەوە.(٦٠)

ناوەڕۆکی ئەم شانۆنامەیە، وەک لە سەرەوەشدا ئاماژەیەکی بچووکی بۆ کرا، بە رادەیەکی یەکجار زۆر لە شانۆنامەی (بە هەڵە لێکگەیشتن)ی ئەلبێرت کامۆی فەرەنسی دەچێت کە لە ساڵی ١٩٤٤ لە پاریس بە زمانی فەرەنسی بڵاوکراوەتەوە.(٦١)

هێڵی بەیانیی چیرۆک و ریتمی پەرەسەندنی ڕووداوەکان و

ژمارەی پاڵەوانە سەرەکییەکان، لە هەر دوو شانۆنامە کوردی و فەرەنسییەکەدا، هەمان شتن. لە هەر دوو شانۆنامەکەدا، پاڵەوان ( لە کوردییەکەدا مەمۆ/ لە فەرەنسییەکەدا ژان) بۆ ساڵانێکی زۆر، لە ماڵ و نیشتیمانی خۆی دووردەکەوێتەوە و گۆڕانی بەسەردا دێت تا رادەی ئەوەی کە لەلایەن دایکی خۆیەوە نەناسرێتەوە. لە هەردوو شانۆنامەکەدا، کاتێ کوڕەکە دەگەڕێتەوە، بە دەستی دایکی خۆی دەکوژرێت. لە هەر دوو شانۆنامەکەدا کوشتنەکە بە مەبەست نیە و لە ئەنجامی بە هەڵە تێگەیشتنە، یان راستتر بڵێین: لە ئەنجامی نەناسینەوەیە؛ چونکە ماوەیەکی زۆرە کە دایک کوڕەکەی خۆی نەدیوە. لە هەر دوو شانۆنامەشدا تەنیا دایک تاوانبارە، بووک ( غەزال) یان خوشک (مارتا) بێگوناهن.

هەڵبەتا، عەبدولڕەحیم رەحمی هەکاری، شانۆنامەنووسە کوردەکەی خۆمان، دیارە، تێکستەکەی ئەلبێرت کامۆی نەدیوە: چونکە پێش ئەلبێرت کامۆ بە نزیکەی بیست و پێنج ساڵ بەرهەمەکەی خۆی نووسیوە. بە هەمان شێوەش، ئەلبێرت کامۆ شانۆنامە کوردییەکەی ئەوی نەخوێندۆتەوە: چونکە دیارە کە ئەلبێرت کامۆ کوردیی نەزانیوە. ئەدی کەواتە، بۆچی ئەم دوو شانۆنامە کوردی و فەرەنسییە، هێندە لەیەکتر دەچن؛ نهێنیی ئەم وەرگرتن و لەیەکچوونە چیە؟

ئێمە واتێدەگەین: ناوەڕۆکی ئەم چیرۆکە ریشەیەکی فۆلکلۆریی هەبێت و لەناو زۆربەی نەتەوەکانی رۆژهەلاتدا هەبێت.(٦٢)

ئەلبێرت کامۆش، وەک دەزانین: ماوەیەکی زۆری ژیانی خۆی لەناو بەربەری و عەرەبەکانی جەزائیر بەسەربردووە؛ لەوێ ئەم چیرۆکە باوەی ناو خەڵکی وەرگرتووە و ئەم شاکارەی لێ دروستکردووە. بە هەمان شێوە، ع.ر. هەکاری، لە دەمی خەڵکەوە چیرۆکەکەی وەرگرتووە و دایڕشتۆتەوە. سەلماندنی ئەوەی کە ئەم چیرۆکە ریشەیەکی فۆلکلۆریی هەیە، پێویستی بەم بەڵگانەی خوارەوە هەیە:

١- لە گۆرانیی فۆلکلۆریی کوردیدا، چیرۆکەشیعرێکی لەم بابەتەمان هەیە، کە ئەمە کۆتاییەکەیەتی:

های، های، های.. مەمۆ
مەمۆ کوڕی عەباسی.
دایە، مەمۆ؛ کورتەک لەسەر کراسی
دەک کۆرە بی؛ نەیناسی..

٢- چیرۆکێک بە هەمان ناوەڕۆک، بە ناونیشانی (چاوبرسی)، لە ژمارە (٤)ی رۆژنامەی ( پێشکەوتن)دا لە ١٩٢١/٦/٢٠دا بڵاوکراوەتەوە.

٣- ئەگەر ئەم چیرۆکە سەرچاوەکەی فۆلکلۆر نەبێت، هیچ هێزێکی دیکە نیە کە ئەلبێرت کامۆی فەرەنسی بە ع. رەحمیی هەکاریی کورد بناسێنێ.

ئەم دوو شانۆنامە کوردی و فەرەنسییە، کە کوردییەکە لە

١٩١٩ و فەرەمسییەکە لە ١٩٤٤دا بڵاوکراوەتەوە، لەم خاڵانەی خوارەوەدا لەیەکتر جودا دەبنەوە:

١- لە کوردییەکەدا دایکی پاڵەوانەکە( چاوڕەش) لەگەڵ بووکەکەی ( خەزاڵ)دەژی؛ بەڵام لە فەرەنسییەکەدا دایکی پاڵەوان لەگەڵ کچەکەی خۆی ( مارتا ) دەژی.

٢- لە کوردییەکەدا پاڵەوان (مەمۆ) لەپێناو سەربەخۆیی وڵاتەکەی ڕۆیشتووە و چۆتە جەنگی سەربەخۆکردنی نیشتیمان؛ بەڵام لە فەرەنسییەکەدا پاڵەوان، ژان، لەپێناو پارەپەیداکردن و بازرگانیدا دایک و خوشک و نیشتیمانەکەی خۆی بەجێهێشتووە.

٣- لە کوردییەکەدا، کوشتنەکە هۆی هەیە نەک ئامانج: لەسەر نامووسە؛ بەڵام لە فەرەنسییەکەدا کوشتنەکە ئامانجی هەیە: لەپێناو پارەیە.

٤- لە کوردییەکەدا، دووای کوژرانی پاڵەوان، شانۆنامەکە کۆتایی پێدێت؛ بەڵام لە فەرەنسییەکەدا، دووای کوژرانی پاڵەوان، دایک و کچەکەش خۆیان دەکوژن ( دایک خۆی فڕێ دەداتە رووبارەوە، کچەکەش، واتە خوشکی پاڵەو انەکە، ژان، خۆی هەڵدەواسێ ).

٥- لە کوردییەکەدا تەنیا سێ پاڵەوان دەبینرێن؛ بەڵام لە فەرەنسییەکەدا چەند شەخسیەتێکی دیکەش ڕۆڵیان هەیە، گرنگترینیان: لاڵە و هاوڕێی ژان.

٦- لە کوردییەکەدا شانۆنامەکە دوو پەردەیە و یەک دیکۆر

دەبینرێت، لە فەرەنسییەکەدا سێ پەردە و چەندین دیمەن و دیکۆری جۆراوجۆر دەبینرێن.

٧- شانۆنامە فەرەنسییەکە، لە باری فەلسەفییەوە، روانینێکی قوولتر و تراژیدیتر دەردەبڕێت، بۆیەش دەبینین: لە فەرەنسییەکەدا حیبکەی رووداوەکان و سایکلۆژیەتی کەسایەتییەکان ئالۆزتر و بەگرێ و گۆلتترن.

٨- لە کوردییەکەدا، تراژیدیا بە مەسەلەیەکی سیاسییەوە گرێ دراوە ( مەسەلەی سەربەخۆیی نیشتیمان)؛ بەلام لە فەرەنسییەکەدا مەسەلەیەکی فەلسەفیی پێشچاوخراوە: بێهوودەیی ژیان و پووچیی بوونی مرۆڤ.

٩- لە کوردییەکەدا پێودانگە هونەرییە شانۆییەکان (تەکنیک، دراما، حیبکە، وێنەکێشانی کەسایەتییەکان، دیکۆر، ریتمی شانۆیی، دیالۆگ و مەنەلۆگ) سادە و سکارن، لە فەرەنسییەکەدا فراژووتر و هونەریترن.

١٠- قەوارەی تێکستە کوردییەکە تەنیا چەند لاپەڕەیەکە، بەلام فەرەنسییەکە قەوارەیەکی فراوانی هەیە و بەرهەمێکی، بێگومان، تۆکمەترە.

## سەرچاوە:

١- ئیبراهیم فەرشی: کورتە باسێکی رێ و شوێنی شانۆ لە کۆندا و شانۆ لە

كوردستـاندا، گـۆڤـاری (رامـان)، ژمـاره (٤٤). هەولێر: شـوباتی ٢٠٠٠، ل ٤-٨.
هەروەها بڕوانە: مجله خواندنیها، شماره ( ٥٢ ). تهران: ١٣٣٦، ل ٣٧.
٢- جەمال رەشید: دراسات کردیه فی بلاد سوبارتو، ل ٤٨ ـ ٤٩ ).
٣-: B. Majid RAZWANI: Le theatre et la danse en Iran, d Daujour d hui, Paris: 1968, p. 3.
٤- تاهیر ئەحمەد حەوێزی: شانۆگەری لە کوردستـاندا، رامان ژمـاره ٢٧، ساڵی ١٩٩٩
٥- Jaques MORGAN: Maison Scientifique en Perse 1889- 1891, V. 4-5, Paris. 1897.
٦- عبیدالله ایوبیان: میر نوروزی ( تاریخچه هنر تئاتر در کردستان ایران ـ قرن نوزدهم)، مـجله نشـریه دانشکده ادبیـات تبـریز، شـمـاره ١٤، ص ٩٥ ـ ١٢٢.
هەروەها بڕوانە: ئیبراهیم فەرشی: کورته باسێکی ڕێ و شوێنی شانۆ لە کۆندا و شانۆ لە کوردستاندا، گۆڤاری (رامان)، ژماره (٤٤). هەولێر: شوباتی ٢٠٠٠، ل ٤-٨.
٧- گیوی موکریانی: کۆڵکە زێڕینە، چاپخانەی کوردستان، هەولێر: ١٩٥٥.
٨- گۆڤاری هەتاو، ژماره ١٧٢و ٢٩ی شوباتی ١٩٦٠، لاپەڕە ١٩ ـ ٢٠.
٩- برایەتی ، ژ ٢٢٠٤، هەولێر: ١٩٩٦/١١/٤
١٠- مـحەمـەد تەیموور: دەربارەی درامـا و رەخنە، گـۆڤـاری کـاروان، ژ ٤١، هەولێر: ١٩٨٦، لاپەڕە ٦٣ ــ ٧٠.
١١- محەمەد تەیموور: شانۆ لە قوتابخانەکاندا، گ. ئوتۆنۆمی، ژ ٢٠ و ٢١، ١٩٨٤، ل ١٠٥ ـ ١١٢و ٧٦-٨٠.
١٢- تاهیـر ئەحـمـەد حەوێزی: شـانۆگەری لە کـوردسـتـاندا، رامـان ژمـاره ٢٧، ساڵی ١٩٩٩
١٣- مـحـەمـەد تەیموور: دەروازەیەکی رەخنەیی درامـای نوێی کـوردی، گـۆڤـاری کاروان، ژماره ٦٤، مایسی ١٩٨٨، ل ٦٠ ـ ٧٠.
١٤- Tzvetan TODOROF: La notion de la litterature, Ed. Point, Paris: 1987, P. 30.
١٥- الموسسه العامه للسینما و المسرح، المسرح العراقی الیوم، بغداد، ص٣، ١٩٧٨.
١٦- Alessio BOBACI: Histoire de la litterature turque, Paris: 1968, P. 4.

١٧- محمد رضا فرهنگ: میر سیف الدین گرمانشاهی، مجله اوینه، پیک بیسنتون، ضمیمه مجله. شماره ١٧-١٨، ت ٨٩-٩٢. هەروەها بڕوانە: ئیبراهیم فەرشی: کورتە باسێکی ڕێ و شوێنی شانۆ لە کۆندا و شانۆ لە کوردستاندا، گۆڤاری (رامان)، ژمارە (٤٤). هەولێر: شوباتی ٢٠٠٠، ل ٤-٨.
١٨- د. محمد استعلامی: بررسی ادبیات امروز، ل ١٦٩- ١٧٠ هەروەها محمد حقوقی: ادبیات امروز ایران، نشر قطره، تهران: ١٣٧٧، ل ٣٧.
١٩- یحیی اریان پور: از صبا تا نیما، ج ٢، ص ٣١١.

٢٠- سەباحی غالیب: دوو تەقەلای بێ سوود، چاپخانەی هەڵوێست، لەندەن: ١٩٨٤.
٢١- ڕۆژنامەی ژیان، ژمارە ١٦٩، سلێمانی: دووشەممە ٢٢ی نیسانی ١٩٢٩
٢٢- محەمەد تەیموور: دەربارەی دراما و ڕەخنە، گۆڤاری کاروان، ژ ٤١، هەولێر: ١٩٨٦، ل ٦٣ ـ ٧٠.
٢٣- * C. J. EDMONDS: " A kurdish newspa-
per " in Journal of the Central Asian Society, Vol. 12;
Part. 1, 1925, p. 83-90.
٢٤- حەمید بۆزئارسلان لە تورکییی عوسمانییەوە کردوویەتییە فەرەنسی .
H. BOZARSLAN: Le Probleme national Kurde en Turquie Kemaliste, Sius la direction de M. ROBERT, Paris: 1986. PP. 138- 140
٢٥- عبدالله جودت: بیر خطاب، گۆڤاری ( ڕۆژی کورد)، ئەستەمبۆڵ، ژمارە (١)، ئەستەمبۆڵ: ١٩١٣، ل ٤. هەروەها کوردناسی ڕووس، ڤ. ئە. گەردلیڤسکی، بە هەمان شێوە، زاراوەی (گەنجە کوردەکان)ی بەرامبەر (گەنجە تورکەکان) بەکارهێناوە. بڕوانە: لاهووتی: کوردستان و کورد، و: جەبار قادر، گ. هەزار مێرد، ژ(٣)، سلێمانی: ١٩٩٨، ل ١٦٢.
٢٦ـ فەرهاد پیربال: پێشەکییەک بۆ سەرهەڵدانی شانۆنامە لە ئەدەبی کوردیدا، گۆڤاری هیوا، بڵاوکراوەی ئەنستیتووی کورد لە پاریس، ژمارە (٨)، پاریس ١٩٩١، ل ٦٧-٧٤.
٢٧- ڕۆژنامەی ژیان، ژ ٢٨، وتارە ناودارەکەی شێخ نووری لەبارەی ڕەخنەی ئەدەبی.

٢٨- د. عزالدين: ئەدەبی نوێی کوردی، ل ٣٩

٢٩- Ahmed HACHIM: Les Tendance actuelles de la litterature turque, in Mercure de France, 35me annee, Paris: 1924. PP 641- 655.

٣٠- د. عزالدين، ئەدەبی نوێی کوردی، ل ٤٤

٣١- رەفیق حیلمی: شیعر و ئەدەبیاتی کوردی، ب٢، بەغدا: ١٩٥٦، ل ٢٠٤، ٢٠٥، ٢٠٦.

٣٢- نووسراوەکانی پیرەمێرد: ڕۆژنامەی ژین، ژمارە (٨٩٣)، سلێمانی: ١٩٤٧ و ژمارە (٩٦٧)، سلێمانی: ١٩٤٩. هەروەها ڕۆژنامەی ژیان، ژمارە (٤٦٢)، ١٤/١٢/١٩٣٥، ل ٦٩.

٣٣- ڕۆژنامەی ژیان، ڕۆژی سێ شەممە، ٢ی ئاغستۆسی ١٩٢٧.

٣٤- بڕوانە ڕۆژنامەی ژیان ژمارەی ڕۆژی سی شەممە ٢ی ئاغستوسی ١٩٢٧، کە وتارێکی ڕەخنەییە، تێیدا ڕەخنەی لە شانۆگەریی نیرۆن گرتووە کە لە نووسینی محمەد لطفی ی میسرییە و لە شاری سلێمانی لەلایەن تیپی قوتابخانەی زانستییەوە لە ڕۆژانی ٢٧ و ٢٨ی مانگی تەمووزی ١٩٢٧دا پێشکەش کراوە.

٣٥-

Ahmed HACHIM: Les Tendance actuelles de la litterature turque, in Mercure de France, 35me annee, Paris: 1924. PP 641- 655.

٣٦- عبدالرزاق بیمار: دانیشتنێک لەگەڵ گۆران، گ، بەیان، ژمارە ٢، بەغدا: شوباتی ١٩٧٠، ل ٣.

٣٧-

Ahmed HACHIM: Les Tendance actuelles de la litterature turque, in Mercure de France, 35me annee, Paris: 1924. PP 641- 655.

٣٨- Jean DENY: Litterature Turque, in Grand En-cyclopedie, Larousse, Paris.

٣٩- Alessio BOBACI: Histoire de la litterature turque, Paris: 1968, P. 4.

٤٠- Metin AND: A history of theatre and poputa, Par-

. is: 1968, P. 349.

٤١- Metin AND: A history , Paris: 1968, P. 349.

٤٢- Metin AND: , P. 349.

٤٣- Alessio BOBACI: Histoire de la litterature turque, Paris: 1968, P. 4

٤٤- Alessio BOBACI: Histoire de la litterature turque, Paris: 1968, P. 4.

٤٥-- Jean DENY: Litterature Turque, in Grand En-cyclopedie, Larousse, Paris.

٤٦- يحيى اريان پور: از صبا تا نيما، ج ٢، ص ٢٢.

٤٧- يحيى اريان پور: از صبا تا نيما، ج ٢، ص ٢٨٩ و ٢٩٢.

٤٨- NICOLAS N. MARTINOTCH: THE TURK-ISH THEATRE, NEW YORK- LONDON: 1968, PP. 19-20.

٤٩- NICOLAS N. MARTINOTCH: THE TURKISH THEATRE, NEW YORK- LONDON: 1968, PP. 19-20.

٥٠- هیمداد حوسێن بەکر: بەکورتی مێژووی شانۆی کوردی، گۆڤاری کاروانی ئەکادیمی، ب ١، هەولێر: بەهاری ١٩٩٧، ل ٨١ - ١٠٠.

٥١- Gerard Chaliand, Les Kurdes et Le Kurdistan,:pcm, Paris; 1981.

٥٢- M. E. BOZARSLAN: Jin, W. Deng, Upsala: 1985, R. 70-77..

٥٣- بۆ یەکەمین جار، مەحموود زامدار لە رۆژنامەی العراق، ژ ٢١٧٣، بەغدا: رۆژی ٢٣ی٣ی١٩٨٣، ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە ئەم تێکستە دەبێتە یەکەمین شانۆنامەی کوردی، پاشان ئێمە، بێ ئەوەی لە پاریسەوە ئاگامان لەم کارەی ئەو هەبێت، تۆژینەوەیەکمان لەسەر ئەم بەرهەمە نووسیوە و لەگەڵ خستنەسەر رێنووسی ئەمڕۆ، لە ژمارە (٨)ی گۆڤاری (هیوا) لە ١٩٩٣لە پاریس بڵاومان کردەوە.

٥٤- زنار صلوبی( قدری جمیل پاشا): فی سبیل کردستان، ت: د. رضوان علی، منشورات رابطه کاوه، بیرووت: ١٩٨٧.

٥٥- Hazim KLIC: E. R. Hekari, Ed. Xani, Danemark: 1991

٥٦- فەرهاد پیربال: پێشەکییەک بۆ سەرهەڵدانی شانۆنامە لە ئەدەبیاتی کوردیدا، گۆڤاری (هیوا)، ژمارە (٨)، پاریس: ١٩٩٣، ل٦٧ - ٦٨.

٥٧- د. فەرهاد پیربال: ع. رەحمی هەکاری، ئەو نووسەرە نوێخوازەی کە بۆ یەکەمین جار شانۆنامەی هێنایە ناو ئەدەبیاتی کوردییەوە، ژمارە (٧١)ی (ئەدەب و هونەری برایەتی )، هەولێر: رۆژی (١٩٩٨/٤/٣).

٥٨- M. E. BOZARSLAN: Jin, W. Deng, Upsala: 1985, R. 70-77..

٥٩- مەحموود زامدار: کۆنترین پیەسێکی کوردی، مەمێ ئالان، رۆژنامەی العراق، ژ ٢١٧٣، بەغدا: رۆژی ٢٣ی٣ی١٩٨٣.

٦٠- جەمشید کوردۆ: لەبارەی مێژووی دێرینی شانۆی کوردی، جریدە « گەل» العدد ٧ اذار ١٩٨٤ ص ٥-٦

٦١- ALBERT CAMUS: LE MALENTENDU, 3 ACTES, ED. GALIMARD, PARIS: 1944.

٦٢-مستەفا نەریمان: لەباری مێژووی شانۆی کوردی، گوڤاری«بەیان» ، ژمارە ١٠٨ حوزیران ١٩٨٥، ل ٢٠٦- ٢٠٧

عەبدولڕەحیم ڕەحمی هەکاری، جگە لە شانۆنامە و شیعرەکانی، پەخشانەکانیشی، بایەخێکی هونەری و ئەدەبیی مەزنیان هەیە.

ناوبراو لە هەمان کاتدا، بە زمانی تورکی دوو چیرۆکیشی لە گۆڤاری ژین لە ئەستەمبۆل بڵاوکردۆتەوە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە نووسەر لە هەموو ژانرە ئەدەبییەکاندا خۆی تاقی کردۆتەوە و شارەزایی هەبووە.

ئەم پەخشانانەی لێرەدا دەیانخوێنینەوە، هەموویان لە نێوان ساڵانی ١٩١٩-١٩٢٠ لە ئەستەمبۆل لە گۆڤاری ژین بڵاوکراونەتەوە.

ع.ڕ. هەکاری لە سەردەمێکدا دەستی داوەتە پێنووس و ئەم پەخشانانەی نووسیوە کە ئاستی نووسینی کوردی لەو ساڵانەدا ١٩١٩ هێشتا زۆر کز و لاواز بووە.

ئەگەر بەراوردی ئەم پەخشان و نووسینانەی ئەو بکەین بە تێکستی نووسەرانی سەردەمی خۆی، بۆمان دەردەکەوێ کە ئاستی ئەم پەخشانانە، هەم لەڕووی ناواخن و بیرەوە، هەم لە ئاستی تەکنیک و هونەریشەوە، تەنانەت لە ئاستی داڕشتن و زمانەوانیشەوە، زۆر بەرزتر و جوانترە.

هەکاری لەم نووسینانەیدا، هەستی نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی لەیەکتر گرێ دەدات و بە بینینێکی شاعیرانە دەیەوێت میللەتەکەی وا لێ بکات خەون ببینێ، ئاوات بە ژیانێکی تازەوە بخوازێت..

هەکاری لەم نووسینانەیدا دەزانێ سەردەمی جەنگ بەسەرچووە و ئێستا (١٩١٩) کەوتووینەتە سەردەمێکی تازەوە: سەردەمی

**شەرێ تۆپان خلاس بوو**

**ئیرۆ شەرێ قەلەمانە**

هەر کەس مەجبووره موهافەزا هەقێ خوه بکەت. ئەگەر نەکەت هەقێ ژینێ ونینه، بێ هەقه. حفزا هەقی ب دوو ئوسوولان دبت. یان دێ ب قەوەتا دەستان، یانی ب واستا تفنگێ، تۆب، بومبا، تەبانجان بت؛ یان ژی ب واستا ئیلمێ حوقووقێ، ب تاریخێ دبت.

وەختێ تۆب و تفنگان چوو. چونکی ب وێ حەق نایێ ئیسباتکرن؛ بەلکی هەق ب قوەتێ یە. کیژکا غالب ئەو خودان هەقە؛ کیژکا مەغلووب، بێقەوەت ئەو بێهەقە.

دیمەک ب شەرێ تۆپان هەق ئیسبات نابت. من تەجروبەکر، وەلات ب خوینێ شووشت. هندە بچووک بێ دا و باب مان ئێتیم و ئێخسیر کەتنە کولانا. هندە خانەدان مەحوو بوون؛ هندە خانی، عائلە بەلاڤ بوون؛ پەریشانی ل سەر پەریشانیێ؛ دیسا چو فایدە نەکر، هندی تر بوو سەبەبێ فەلاکەتێ. وەکی وەیە شەرێ تۆپان خلای بوو. ڤێ جارێ هەمییا زانی، هەق ب واستا عالمییێ یە، قەلەمێ دێ بێتە هلکرن. هوون دغەزەتان دا دخوینن کو مەجلسا سولحێ دایە بەرهەڤ دبت. هەم غەزەتەکێ دگۆت:

«(۲۸) کانوونا ئەول مەجلسا سولحێ دێ دەست شولێ بکە. چو کەسێ دەعوایەک هەبت بلا نەوەستت؛ مووجبێ عیلمێ

حقووقێ، عیلمێ ئەزمانان، عیلمێ ئەردی، عیلمێ تاریخێ. حەقێ خوە دەعوا و بێتە وێ مەجلسا کو ئومووم دنیا ل وێ بەرهەڤ دبن، حەقێ خوە ئیسبات بکەت و لێ ببە خودان».

دەعوا تۆپ، تفنگ، شەش دەربان، بۆمبایان خلاس. دەعوا قەلەمێ یە. قوەتا عیلم و زانینێ حاکمە ل سەر هەمی تشتان. دڤێت خودان قەلەم بخەبتن خودان پارە هیمەتێ بکن؛ هندە دانە تۆپ، تفەنگ چاریکا وێ بدنە قەلەمێ عیلمێ و غەزەتان، چونکی هەمی کەس زانی تۆب، تفنگ هندێ قەلەمێ شۆل ناکەت. جهێ ب تۆپان هاتنە ستاندن ب قەلەمان ڤەگێرانە. مەسەلا صربستان، بەلجیکا، قەرەداخ، رۆمانیا ب تۆپان هاتنە ستاندن، ب قەلەمان ڤەگەرانە و هندی تر مولکستان بۆ خوە ستاند. هەتەزانین کو شەرێ تۆپان خلاس بوو، شەرێ قەلەمانە. ئەم ژی هندەک خودان قەلەم رێکنە ئاوروپایێ؛ ب قەلەما خوە بخەبتن، حەقێ مە ئیسبات بکن.

**«حالێ مەیێ حازر»**

ئەم کورد دناڤ ئوسمانیان دا سادقتر «راستگوتر» ژ هەمی مللەتان دەرکەتن. مە مالێ خوە و جانێ خوە، هەمی تشتێ خوە د ریا وی مللەتی دا «یان ئوسمانی». مە رۆژەکێ ئیختیلالەک بێ ئیتاعیەک نەکر. دائیما ئەوان چ ئەمر کر، مە ئەمرێ وان ب جی ئیناند.

هەتا دڤێ حەربێ دا «یانی شەرێ جیهانی یا یەکەم» ئەم کورد ژ بەر حەربێ، ژبەر هیجرەتێ «مشەختیێ» ژبەر سەفالەتێ ژ هەمی یان پەریشان تربوون. وەلحاسل، ژ هەمی مللەتان خودان زەرارتر دەرکەتن. مالوومێ وەیە، هون هەر رۆژ غەزەتان «رۆژناما» دخوینن، تالێ حەربێ ئەم مەغلوب «شکەستی» دەرخستن. ئەم ل سەر دەعوا رەئیسێ «سەرۆک» جومهورێ «کۆمار» ئەمریکایێ ویلسون مە دەعوا سولحێ کر. یانی موتارەکە گرێدا، - ژبەر مە بولغار موتارەکە کربوو- پاشێ ئاوستریا و ئەلمان ژی موترەکە کر. دێمەک دنیا ژ هەمانا خوینێ دەرکەت، هەمی کەس نفرەت ژ یەک دوو کوشتنێ کر، هەرکەس ژ تەرەفێ خوە ئەسبابێ سەعادەتا ئینسانی فکر کرن. ژ وان هەمیان فکرا ویلسون دورسترە. لەورا ئەو دبێژن «هەر مللەت دڤێت ب سەرێ خوە شۆلا یێ دی نەکەت» یانی مللەت موقەددەراتا خوە ب دەستێ خوە هەلکەت، چ مللەتێ د

خوه دا دبینت بلا بته حکومەت. ل سەر ڤێ فکرێ، ئەم وێ دبینن عەرەب، جوهی، فەلە، گورجی... هەر یەکێ ژبۆ خوه حکومەتەک چێکرن، نوها شۆلا خوه ب دەستێ خوه چێدکن. بەلێ ئەم کورد هەتا نوها مە حس نەکری یە ژ بەر دەستێ حکوومەتا ترکان دەرکەڤن، یانی ژ مەنزوما ئوسمانی دەرکەڤن. نوها ئەم تەماشا دکەن، ویلسون دبێژت «جهێ ترک نەری نادنە ئوسمانیان»

حال ئەوە کو جهێ مە دبێژنێ «کوردستان» غەیرێ دو- سێ مەئموران ئەوژی ژبەر مەئموریەتێ هاتنە جی بوونە، بل وانا چو ترک نینن. وەکی ترک چونین، ما ئەرمەنی، مخەین؟ هندی ئەرمەنی نە میقدارێ سەدان پێنجێ مە نینن. مخەین ژی سەدان چ مللەتێ دی چونینن. وەکی وەیە، کوردستان هەقێ کوردانە، ژ غەیری کوردان هەقێ کەسێ تێ نینە. سەد حەیف مە هەتا نووها خوە نەدایە زانین. ئاورپا مە ناس ناکن و مە وەها مەزن نزانن و کوردستان تێکەلێ ئەرمەنیان دزانن. هەتا هندەک خودان غەرەز مە ژ ئەرمەنی یان دزانت.

وەکی مە خوەدایا زانین لازمێ سەعی و خیرەتا گەلەک نەبوو ب هیمەتا هندک مە دێ هەقێ خوە دابا زانین (ئەم ژی سەدەدا خوە دەرکەتن، قوسوورێ نەفکرن).

بەلێ هەقێ کوردانە کوردستان. ژ غەیرێ کوردان چوو کەس خودان هەق نینە د کوردستانێ دا.

فکرا ویلسون ژی هەقەک دایە مە کو ئەم د کوردستانێ ببنە

خـودان. ئەگـەر ئەم نەبنە خـودان، قـەت شـوبهـە نەكن. ئەرمنى بت سـەدان دەهێ مـە، دێ بنە خـودان كـوردسـتـانـێ و وەلاتێ مـە دێ ژ بۆ خوە بستينن.

وەكى وەيە، چ مـەزن چ بچـووك، هەمى مللەت ب وەزيفـا خـوە بزانت و دەست شـولێ بكەت. وەخـتێ وەسـتـانـێ نينە، وەخـتێ خەباتێ يە، خودێ موعين بت.

**«بچکوکەک عیبرەت»**

ئەی گەلوو هەڤالان!

دنیــا ب چاڤ لێکری ئاڤــا بوویە. مـرۆڤ چاڤ هەڤـالێ خـوە دکەت؛ ئەو چاوا دخەبت، مـرۆڤ ژی دڤێت وسـا، بەلکو گـەلەکـتر خەبتت.

مـالوومێ وەیە، دکوردسـتـانێ دا دو ملـلەت هەیە، یەک ملـلەتێ مـە، یەک ژی ملـلەتێ فـلان. ئەم وێ دبینن و د غـەزەتان دخـوینن، خەباتـا وان ب شـەڤ و رۆژ، مـرۆڤ لێ حـەیران دمـینە. هەر رۆژێ غـەزەتەکێ، هەر رۆژێ مـەجـمـووئەکێ، هەر رۆژێ کـتـێـبـەکێ دەرێتخن. خودان قەلـەمێ وان ب قەلەمێ خوە، خودان عـیلمێ وان ب عـیلمێ خوە، خودان تفنگێ وان ب زۆرا دەستان و ئەشقیـاتیێ، خـودان سـیـاسـەتێن وان ب ئەزمـانێ خـوە، دەولەمـەندێن وان ب دەولەتا خوە، خودان بانقە ب پارێد خوە.

وەلحـــاسـل، چیێ وان هەی ژبـۆ ملـلەتێ وانە، یانی مـلـلەت ب هەمی تشـتێ وان فایدێ دبینت

ئەو وەکی مە مێرێد خوە دریا بێفایدە نادنە کوشتن؛ پارێد خوە بادی هەوا ئیسراف ناکن؛ بێ مەنفیعەت سەعیێ ناکن.

حال ئەو حالە، مێرێد مە ب یەکدوو کوشتنێ دمرن؛ پارێد مە بۆ لەیز باران، مـتـربان، دەروێشـان، پەروو و خـەلاتـن، مـێـهـڤـانیـان،

رشوەتان، دچن؛ ئەزمانێ مە ب غەیبەتا یەکدوو شل دبت.

ئەڤـە حـالێ مـە، ئەڤـە حـالێ وان. ئەو دخـەبتن، ئەم رادزێن. کەسێ نەخەبتت هەقێ ژینێ چونینە. ژڤان خەبەران هاتە زانین ئەم چەند قــەدەر پاشــڤـە مــایی نە و رەقــیــبــێت مـە چەند قــەدەر پێشڤەچوویی نە. ئەڤە ژبۆ مە سەبەبێ عیبرەتێ یە. ئەگەر ئەم ژێ بچوکەک عـیبرەت بگرن، ئەم ژی هەر وەکی هەمـیـان د بگیـهـینە مرازا خوە.

خودێ ئاریکار بت، ئامین، بەلێ ژبیرنەکن، خودێ د قورئانێ دا ئەمر کردی یە «وأن ليس للإنسان إلا ما سعى»

**«خەوا مە»**

ئیـرۆ، کـو هەمی مللەت ژ خـەوا سـبێ رابوونە، ژبۆ ژینا خـوە دخەبتن، مـەلاییێت هەر مللەتەکی ل سەر منارێت خوە بانگێ سبێ ددن، هەوایێ سبێ یێ ساف ل سـەر هەمی مـەخلوقـات ئەلامـەتێ ژینێ بـەلاڤ دکـە، ئەم هێـژ د خـەودانن! بەلێ، هەر کـەسـەکێ بارێ خوە بـارکرن ب رێ کـەتن، ئەم هێلانە جهێ واران، ل جـهێ وارێت کو ژ خێرێ مەکەس نەمایە، وارێ مە کەڤن بوونە، مال و دەوارێت مە ژبەرێ گیاهی وێ هەمی تەلەف بێن، پاش هنگێ ئەم دێ چاڤێ خوە ڤەکن...

– هەی هۆ! گـەلۆ مە چ کـر! ئێڤـارە، ئەم ناگـیـهـینە چو واران و پەزێ مـە دێ گـور بـخوت. ئەم کـەنگی بگەهنە ورەکی، سـێلا خـوە داینن، ل سـەر نانێ خوە ب بێژن. زارێ مـە برچی نە، ئەڤـە چ بو، مە ل سەرێ خوە ئانی... پوشمانی یا پاش فایدە ناکەت.

– ئەم هێژ دخەودا نن! ئەم دخەوەکێ وەسا دانن، هەتا مەلاییێت مە وەختێ بانگی بەرزە کرنە. کەلەبابێن مە لال بونە، ئەوژی بانگ نادن، کـەرێ یێت پەزی ل سـەر شڤـانان چونە، ئەو هێژ د خـەودانن ماستێت مە ل بەر تیر هەتاڤێ د مەنجـەلان دا کرکشینە. دەوارێت مە بەنێت خوە بزداندنە، ب چولێ کەتنە. ئەم هێژ دخەودانن. ئێدی بەسـە. قـەت چو نەبێ، نوێژا سـبێ، کـەیا هەتاڤێ ل مـە چو، هێـژ

ئیڤار نەبویە ئەم هشیار بین، نڤێژا نیڤرۆیا وەقتێ بێری یێ ل مە نەچت. ئەگەر وەقت ل مە بچت پەزێ مە دێ بهەڤشت، ئەم دێ ژ شیرو ماستان بین، ڤێ جارێ حالێ مە ببیتە چ؟ ئەم دێ هیگنێ بگرین، ئەمما بگرینێ چو چێ نابت. خەبەرا باب و باپیرانە: «وەکی گرین فایدە بکرا، بابێ من دێ ژ گۆڕێ رابوبا».

– من گۆت «خەو». ئاقلێ تە نەچیتە خەوا شەڤێ ل بن نڤینان، بەلکی خەوا شەڤ و رۆژان ل بن نەزانینێ و جەهالەتێ– ئەگەر ئەم– خەوەکێ وەها نەبان، مە دێ تەماشە بکرا ئینسانییەتێ د دنیایێ چاوا دخەبتت، ل بن ئەردێ، ل سەر ئەردێ، ل ئەسمانی، هەر رۆژێ تشتەکی دەرێخت. تەلەفون، تلگراف، شەمەندەفەر، ڤاپور، تەلگرافا بێ تێل.

ئەلەکتریک، تەیارە، بالون... ئەو هەمی ژ ئەسمانی نەبارینە، ژ ئەردێ شین نەبوونە، بەلکی ژ دەستێ ئینسانان چێ بون.

– ئەو ژ دەستێ کیشکان چێ بویە؟

– ئەوێت هشیار، ئەوێت هشیار.

– ما ئەم هشیار نینن؟

– وەکی ئەم هشیار بان، تشتێ ژبۆ مە لازم، مە دێ دیتبا.

– چ ژبۆ مە لازمە، مە نەدیتی؟

– زانین... زانین... زانین...؟

– ئەز تەماشەدکم؛ هجی تشتێ دبێژنێ قەوەت، ئەو ب دانایەکا کەرییێ بێ ئەهمیەت چێ بوونە. مەسەلا ئەهەمییەتا موویەکێ چونینە.

وەکی بەرهەڤ دکن، درێسن، دبیتە بەن. ئەوان بەنان تێکدا رادچینن، دبیتە وەریس، قەوەتا وەریسی دبینی. سێ و چار مێر نەشێن بزدینن.

– هەر وسان تەماشە دکم، تۆگلێ کرکرکان پوشەکەکە بێ ئەهمیەتە، وەکی درێرسن دبیتە کاب. وان کابان تێکدا رادچینن، دبیتە «خالات» کو وا پورێد هندە مەزن و هندە ب قەوەت هەر وەکی کەلەکەکێ دکێشتە ئیسکەلێ. دیسان تێ دفکرم چیایێد هندە مەزن دقەورینن. ریان چێدکن، هندە قەدەر پالان، هندە قەدەر هۆستان ددنە شولێ. مەسرەفا وان هەسابا ملیونان. ئەجەبا ئەو پارە ژ کیسکێ مرۆڤەکی دەردکەڤن؟

– نەخێر

– ب چاوان بەرهەڤ دکن؟

– مەسەلا هەر کەسەک مەهتی دەه قورشان ددن. سەرێ مرۆڤێ دەه قورش، یا هەزار مرۆڤان دکەت دەه هزار قورش. د دەه مەهان دا سەد هەزار دکەت. کارێ وی ژی هندە پارە ددن دینێ بانقەک.

ب وێ حەقێ چیان وەردگەرینن، شەمەندوفەران چێدکن، دنیایێ نێزیکێ یەک دکن.

بەحران تێکەلێ یەک دکن، جەمان وەردگەرینن، شۆلان دکن، کریاران راست دکن.

- ولحاسل تشتێ بێ ئەهمیەت ئەم کو لێ دفکرن، دەولەت ل سەرێ تەفاق و یەکبوونێ دبیتە تشتەک مەزن. ژ وێ هندێ یە هەمی مللەت بەرێ تەفاقێ چێدکەت، پاشێ د شولان دا مووەففەق دبت. مەقسەدا مە ئەوە کو ئەم ژ هەمی مللەتان پاشڤەماییی نە ئاقل ژ بەن و رێسان و کاب، خالاتان بگرن. بەرهەڤ بن، ببنە یەک. ئەگەر نە؛ دەست ب فاتحە و یاسینێ بکن، کو ل پێش هوزوورا خودێ دێ چاوان جەوابا خوە بدن.

چونکی خوینا مللەتەک وەها رەبەن خودێ دێ ژ مە بخوازت. ژ من گوتن، ژ وە ئیتتفاق، ژ مەزنان هیمەت، ژ بچووکان خیرەت، ژ رووهانیەتا پێغەمبەر ئالەی هی سەلات و وەسەلام ئیمداد، ژ خودێ مووەففەقییەت.

**«بچوکێ نەگریت ناخوت»**

– ئیروکە ئەم ژی ژ دنیایێ خودان باهرن. یانی، وەکی خودێ دنیا ئافراندی، نعمەتێن خو ل سەر هەمی مللەتان بەلاڤ کری، ئەم کورد ژێ جودا نەکرنە دێمەک باهرا مە هەر وەکی هەمیان ددنیایێ هەیە حال ئەو حالە هەمی مللەت خودانییێ د حەقێ خوە دکەن، بەلێ ئەم جارەکێ حەقێ خوە ناس ناکن هەتا خودانییێ لێ بکن، وەکی ئەم حەقێ خو ناس ناکن مللەتێ وەکی جیناریێ مەیە ئەو ژی حەس ناکت کو ئەم حەقێ خو بزانن، لەورا نەزانینا مە کاریێ وانە ب وێ دبنە وارسێ مە، حەقێ مە ژبۆ خو دستینن. ئەم ژی مللەت بێ حەق دناڤ واندا دمینن، بەر دەستێ وان، دبن زولمت وان مەحو دبن. چونکی ئەم حەقێ خو ناس ناکن کو ژ بو بگرین.

ژبەر نەگرینا مە خەلقێ کو دنیایێ ب تلیا خوە دگەرینن ئەو ژی مە ناس ناکن دەنگێ مە نابهێن حەقێ مە ددنە دژمنان! وەکی وەیە عەقلێ خو بینن سەرێ خوە، دەست باڤێژنە گریینێ بلا ئاه و فیغانێت مە بچنە فەلەکێ وەلوەلێ بێخنە دناڤ هەمی عالەمێ، جا خەلق بزانت ئەم ژی هشیارن و ژبۆ حەقێ خو دگرین مەژی ژ دنیایێ هەروەکی عالەمێ باهرا خو دڤێت.

بەلێ، ئیروکە مە ژ هەمی مللەتان زەهفتر لاو دانە کوشتن و ژ هەمی کەسی گەلەک تر خودان زەرەر بونە؛ ژ هەمی قەومان

پەریشـان تر بونە، بوچی؟ ئەم دەعـوا حـەقـێ خـو ناکن کـو هەتا چو خـیـانە ل هەمـیـان بەلاڤ دکن ئەم مـاینە بێ حەق، ئێخـسـیـر دبن دەستێ نەیاران!

– دڤێت ئەم قەنج بزانن، ئەگەر ڤێ جارێ ئەم ل هەقێ خوە نەبن خـــودان، هەتا هەتایێ ئەم دێ خـــوە بەرزەبکن، کـــوردیتـی، کورمـانجیـتی، نـامـینـتـە ل دنـیـایێ، بچوکـێت مـە دێ ژ دین ڤـەگرن (مەعازەللا) دێ قەبر، کورێت مە بکۆلن، هێسکێت مە دەرێخن، باڤ و دێ لەعنەتێ لێ بکن.

ژبەر ڤێ مـەسـئـولیـەتا مـەزن چاوان دەرکـەڤنە لپـێش خـودێ و پێغـەمبـەران کو ئەم دێ ببنە سەبەبێ هندە ئسلامان؟ دەما دی من گوت «بگرین».

– عەجابا ئەم دێ چاوان بگرین؟

– گریا ب چاڤان، وەراندنا روهنگان چو فایدێ ناکەت، دڤێت ئەم ب غەزەتان بگرین.

–ما ب غەزەتان (رۆژناما) تێتە گرین؟

– بەلێ، دەنگێ غـەزەتان دچیـتـە گـوهێ هەمی خـەلقێ، هەتا ئاوروپایێ و ئاسیـایێ و ئامریکایێ دگرت، هەی ئیـقلیـمێت جیـهـان خەبەران، ئاه و فیغانان دگەرینن.

– باشە، غەزەتە دێ ب چ ئەزمانی دەرکەڤت؟

– ئەو جەوابا تە مـەزنە. ئەو دڤێت ژ بو مە، هشـیـارکرنا مـە و ژبۆ دانەزانینا ئەحوالێ عـالەمێ ب کورمـانجی، پاشی ژ بو دەنگێ

گرییا مه کو بگهیته گوهێ ئاوروپایێ، ب فرەنگی «فرنسی». یا دیتر ژبۆ ئاریکاری کرنا عالەما ئیسلامی دگەل مه ب ترکی؛ سێ غەزەته «رۆژنامه» ژبۆ مه لازمن.

– خولاسا فکراته ژبۆ خلاسبونا مه چیه؟

– گرین... گرین... گرین...

– ئیروکە د قەلبێ مە هەمییان ئەڤینیەک هەیە، ئاگرەک هەیە کو ئەم دایما ب وێ ئەشقێ، ب وێ ئەڤینییێ دسۆژن، و ژبەر وی ئاگری ئەم نەخودان مالن نەخودان کورن، نەخودان هەیاتن، وەلهاسل هەمی تشتی خوە ئەم هازرن دوێ رێ دا بدن.

ئەو چ ئەشقە، چ ئەڤینی یە؟

ئەلبەت ئەڤینیا وەلاتە؟

لەوا ئەو وەختێ من ل وەلات دەرباز کری چو جاران ژ بیرا من ناچت، هەمی وەختان ل پێش چاڤێ منە، ئەو زوزانێ رەنگ.. رەنگ دگولان دا خەملی، ئەو سۆست و بەیبوونێد تازە دبن کەوییێد بەرفێ دەرکەتی، ئەو هەوایێ ساف ب وان بێهنان نوموونەکی ژ جەنتەتێ یە. ئەو کەریێت پەزی وەختێ دکالن، ئالامەتا ماسوومیەتا کوردانە.

ل هەمی دەران زۆزان هەنە، ل هەمی دەران پەز هەیە. ئەز نزانم ژ بەر چ، هندێ وان زوزانا، وان چییان وان پەزان ل من شیرین تێتن.

– نزانم بەلکو بچووکاتییێ دایما دگەل وان بوهارتییە سەرا هندێ، یان ژی وەکی خوەدا ئافراندی وەها شرین ئافراندییە؛ یان ژی کەسێد ل وێ دا ب ئەزمانێ من خەبەر ددن و باب و برایێت من

ل ویٚ نه ژبەر وی قاسی. ولهاسل ئەز تیٚت گیهیم.

- تەنێ ئاگرەکی، ئەشقەکێ چار رەخێت میٚلاکێ من وەرهاتییە، دایم دسۆژت، دقەلینت. وەختێ بەهسێ وەلات دکن، ئەز تەخمین دکم وێ ل بەر شۆلەک مەزن وەستامە؛ و رییا وێ شولێ، وێ خەباتێ جانێ خوە بدم، بمرم ژبۆ دەرهال دەنگەکی ژ وجدانا خوە دبهیٚم کو:

ئاقلێ خوە بەرهەڤ کە؛ وەختێ مرنێ نینە، وەختێ ژینێ یە، ل سەر ڤێ نەسیهەتێ چاڤێ خوە ڤەدکم، چار تەرەفێ خوە دنهیٚرم تشتێ ژبۆ ژینێ لازم، زهف کیٚمن.

دناڤبەینا ژین- مرنێ وەستام؛ موتەهەیر و دوومایی، هەردو دەستێ خوە دایە جیٚنیگان، خەما دکم.

دوێ هالێ دا من دیت ژ نۆدا دیتر دەنگێ قورئانێ تیٚت، من گوهداری کر، سورەیێ، تەنزیل، دخوین. ئایەتا لا تەقنەتوو مین رەحمەتی الله.

گوهێ من کەت. ب وێ مزگینیێ ئەز رابووم. خەریتا وەلاتێ خوە ڤەکر ناڤێد باژاران و گوندان من خوەند و ب وێ موتەسەللی بووم.



عبدالرحیم هەکاری لە سالێ ١٩٥١، جانتایەک بەدەستیەوە،
ل گەل وفدی کۆنفرانسی ئیسلامی، دەچیتە پاکستان



شاعیر لەگەل ژنەکەی، هیدایەت خانم و مندالەکانیان: ژالە، پرتە، هالە، مەتین (کەلەوێ/ ١٩٣٠) لە زگی دایکیەتی.



28 TEMMUZ 1961

FİYATI 15 KURUŞTUR

KARAGÖZ

KURULUŞ TARİHİ: 10 AĞUSTOS 1908

Cuma Günleri Çıkar Türkiye'nin En Eski Siyasi Mizahi Halk Gazetesi

نومرو ١ سنه ١٣٢٦ شعبان ٤ بازارایرتسی سنه ١٣٢٤ اغستوس ١٨ سنه ١

یەکێک لە گۆڤارە شانۆییەکان لە ئەستەمبۆڵ ١٩١٥



تماشا

نسخه‌سی ٥ غروشدر .

نسخه‌سی ٥ غروشدر

1918

بو هفته :

هفته مصاحبه‌سی :

ناصل اوینادلر ؟ . . . . . . . . حسین کاظم

تماشا شئونی :

تماشا ذوق ومطبوعات . . . . . . . عمر نوری

حیات :

أرطغرل محسن بك ایچون . . . . . . . . ب.

رمضان مصاحبه‌سی :

رؤیاده تمثیل . . . . . . . . . روشن اشرف

تفرقه‌لر :

معمای قلب . . . . . . . . . حسین کاظم

سوك أمل . . . . . . . . . . جالبه فؤاد

غرب معاصری :

تئودورلوس

باب عالی قارشوسنده نومرو ٤٣

یەکێک لە گۆڤارە شانۆییەکان لە ئەستەمبۆڵ ١٩١٨


No 36 — 2e année 21 Juin 1920

JINE

( La vie )

Journal hebdomadaire kurde

Adresse: Sublime porte—rue Eboussaoude.

ژین

بازار ایرتسی — ۲۱ حزیران ۱۳۳۶ — نسخه‌سی ۲ غروشدر

صلح مجلس عالیسی طرفندن تورکیه‌یه تبلیغ ایدیلن معاهدهٔ صلحیه‌نك كوردستانه متعلق موادی

ژماره (٣٦)ی رۆژنامەی (ژین) لە ئەستەمبۆڵ، کە لە ساڵی ١٩٢٠ دەرچووە، ئەو شیعری ناوبراوی بڵاوکردۆتەوە کە بە ناونیشانی «شەهیدێ کوردستان.. هەمزە بەگ» نووسیویەتی.

هەر لەوێشدا بابەتێکی زمانەوانیی بڵاوکردۆتەوە.




ئارمی یەکێک لە کلووبە شانۆیەکان لە ئەستەمبۆڵ

## وەشانێن سپیریز




١- **زنیــارێن چیــای**: دیوانا د. بەدرخــان سندی یە، کو سەرجەم هەلبەستێن وی تێدانە و ئەڤ کتێبە ژ قەوارێ ناڤنجی یە و ژ (٢٥٦) بەرپەڕان پێکدهێت.




٢- **فــەرهەنگا گــولی(فــارسی ـ کــوردی- کرمانجی)** ژ لایێ (مسعود خالد گولی)ڤە هاتیە دانان، ئەڤ کتێبە ژ قەوارێ مەزنە و ژ (٤٠٠) بەرپەڕان پێکدهێت.




٣- **ئەرزێ و بەرکر بەگێ ئەرزی**، کــتێب ژ قــەوارێ مــەزنە و ژ (٢٠٨) بەرپەران پێکدهێت. ئەڤ کتێبە ژ لایێ (محمد امین دۆسکی)ڤــە هاتیــە نڤــیسین و ئامادەکرن.




٤-**پلانا ژێر** ژ نڤێسینا (جاهیدا بیری)یە، و نیگارێن وێ ژ لایێ هۆنەرمەند (نجم الدین جبرائیل)ڤە هاتینە کێشان کتێب ژ قەوارێ مەزنە ژ (٤٩) بەرپەڕان پێکدهێت.




٥- **سعدالله ئاڤدەل شاعر و پێشمەرگە و شەهید**: ژیان و سەرجەم بەرهەمێ هۆزانڤان سعدالله ئاڤدل کو ١٩٨٩ د ناڤ ریزێن شۆرەشێ دا شەهید بوویە، ئەڤ کتێبە ژ (٢٦٤) بەرپەران پێکدهێت.



٦- **بنگەهێن راستنڤیساندنا کوردی(کرمانجی)** کتێب هاتییە ڤەگۆهاستن بۆ ئەلفابێیا عەربی ژ لایێ (مسعود خالد گولی)ڤە ئەڤ کتێبە ژ (٢٥٦) بەرپەڕان پێکدهێت.




٧- **كوردستان العثمانيه فى النصف الأول من القرن التاسع عشر**: ناما ماستەرێ یە یا قوتابی (کامیران عبدالصمد دۆسکی) ئەڤ کتێبە پتر ژ (٢٤٨) بەرپەڕان پێکدهێت.






٨- **کێزا تەرەجان**: (٩) چیرۆکێن فلکلۆری یێن زارۆکانەئەڤ چیرۆکە هاتینە کۆمکرن ژ لایێ (سەلمان کۆڤلی)ڤەو نگارێن وێ ژ لایێ (هدی احمد)ڤە هاتینە کێشان کتێب ژ قەوارێ مەزنە و ژ (٥٦) بەرپەران پێکدهێت.




٩- **بەیتێن کوردی**، ئەڤ کتێبە ژ (١٧) بەیتا پێک دهێت ژ کۆمکرنا محمد عبدالله، کتێب ژ قەوارێ مەزنە و ژ (٢٢٢) بەرپەران پێکدهێت.




١٠-**حەیرانۆک**، کۆمەکا حەیرانۆکێن کوردینە ژ کۆمکرنا عبدالعزیز خیاط، کتێب ژ قەواریێ مەزنە و ژ (١٣٥) بەرپەران پێکدهێت.




١١-**الحركه القوميه التحرريه فی کوردستان العراق ١٩٣٩- ١٩٤٥** ناما ماستەرێ یە یا قوتابی (عزیز حسن بارزانی) ئەڤ کتێبە پتر ژ (٢٤٤) بەرپەڕان پێکدهێت..